# ڕاڤەی قورئان یا ڕاڤەی توراس؟

هەوڵێکە دەربارەی پرسی چەمکی کەنیزەک و جاریە
لە قورئان و توڕاس



سەلام ناوخۆش

کوردستان ٢٠١٦

# ڕاڤەی قورئان یا ڕاڤەی تورات؟

هەوڵێکە دەربارەی پرسی چەمکی

کەنیزەك و جاریە لە قورئان و تورات

# ڕاڤەی قورئان یا ڕاڤەی تۆراس؟

هەوڵێکە دەربارەی پرسی چەمکی کەنیزەک و جاریە لە قورئان و تۆراس

سەلام ناوخۆش

کوردستان - 2016

# ناوەڕۆك

به ناوی خوای گەورە

## دەروازە :

کۆیلایەتی و کەنیزەکی لە ئەوروپادوو دیاردەی ئابووری و بازرگانی بوون ، ئەو دووە هەم لە کۆن دا هەبوون ، هەمسەردەمی جاهیلیدا ، ئیسلام کە مەنزڵی مرۆڤی لا گرینگە و لە زۆر پرسە هەنووکییەکان کردۆتیە چەقی پرسەکان ؛ پەیتا پەیتا کاری لە سەر وشککردنی سەرچاوە و بنبڕکردنی هەردووکیان کردووە. سەبارەت بە کۆیلە کەسانی وەك بیلالی حەبەشی کڕیوەتەوە هەروەها سزای چەندین تاوانی بە کەفارەتی ئازادکردنی کۆیلەیەك بەستۆتەوە...

ئەم نووسینە لە دەروازەی ڕێخۆشکردن و سێ بەش پێکهاتووە :

لە بەشی دەروازەدا قسە لە سەر هەوڵەکانی نووسەر کراوە لە بیاڤی ئیسلامیدا هەروەها قسە لە سەر چەمك و زاراوەکانی بوارەکە کراون . لە بەشی یەکەمدا قسە لە سەر بەندایەتی لە مێژوو کراوە .

لەبەشی دووەمی ئەم توێژینەوەیە قسە لە سەر (مولکی یەمین - کەنیزەك) بە درێژی دەکرێت .

هەندێ ڕاڤەکار و سیکیولەری سەردەم ، لە ژێر هەژموونی توراس دا دیاردەی ما ملکت ئەیمانکم – مولکی یەمین، کەنیزەك...بە جاریە و کۆیلە ڕاڤە دەکەن . لە ڕوانگەی قورئانەوە بە هیچ جۆرێك ما ملکت ... جاریە و

کۆیلە نییە ، چونکە جاریە ( بە تێگەیشتنی ئەمڕۆ ) لە گوتاری قورئاندا جێی نابێتەوە ، کەواتە چۆن ما ملکت ...جاریە دەبێ؟؟

لەم توێژینەوەیەدا ، دەردەکەوێت ما ملکت لە ڕوانگەی قورئانەوە (مێ) و ( نێر )ەی هەیە .... بەو تێگەیشتنە سێکسیە بێ هۆمۆسێکچوەل و لیسبیەن ( جنسی هاوڕەگەزی ) لە قورئاندا جائیز دەبێ ، نەك گوناهی گەورە بن هەروەها لە لایەکی تر ما ملکتی نێو قورئان لە سەر کۆنتێکستی شوێن situational context دامەزراوە و بۆیە واتای جیا جیا دەبەخشێت ، لەوانە

١. ئافرەتی ئیمانداری ئەهلی کتاب : جوولەکە ، نەصرانی ، زەردەشتی .
٢. خولامی ژن
٣. خولامی مندالّی مێ
٤. خولامی نێری نابالّغ
٥. پەککەوتە و کەنەفت

نووسەر باوەڕی وایە مانەوەی کەنیزەك –کارەکەری مالآن پەیوەندی بە شەڕ و شۆڕ و دەرئەنجامەکانی شەڕ وەیە ، بۆیە مانەوەی کەنیزەك وەك دیاردەیەك لە کۆمەلگای عەرەبی ، دەگەڕێتەوە بۆ توراسی عەرەبی ، بە واتای داهێنراوی مرۆڤن ، نەك خودای بالآ دەست . لە لایەکی دی خودی کەنیزەك و جاریە زۆر تێکەلّ یەککراون ، بوونی کەنیزەك لە کۆمەلگای ئیسلامیەوە هیچ پەیوەندی بە سێکسی ئازادەوە ( سێکسی دەرەوەی مالّ ) نییە ، بەلکو بەستراوەتەوە بە ڕەوشی ئابووری و

کۆمەڵایەتیەوە ، بە واتای هەبوونی کەنیزەك پەیوەستە بە کۆ ئابووری کۆمەڵگاوە . قورئان هیچ پاڵپشتیەکی مانەوەی کۆیلە و جاریەی نەکردووە .

دوای وەفاتی ڕەسول ، لە ئەبوبەکرەوە هەتا عومەری کوڕی خەتاب ، ململانێی نێو کۆمەڵگای عەرەبی کپ بوو ، ئەوەی هەبوو تەنیا هەرای هەڵگەڕاوەکان بوو ، بەڵام لە کۆتایی خێلافەی دووەمەوە ، سەرەتای دەرکەوتنی ململانێ لە کۆمەڵگەی عەرەبی دروست بوو . لە پرۆسەی فەتحکاری وڵاتاندا تا ئیسلام بە نەتەوەی دی ئاشنا بکرێت ، لێرە و لەوێ شەڕ لە نێوان خیلافەی ئیسلامی و کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانە دروست بوو . لەو شەڕ و شۆڕانەدا ، دوور لە بازگانی کردن بە مرۆڤەکانی دیل ، شەرعاندێکی توراسی لای هەندێك مرۆڤی عەرەبی دروست بوو ، کەچی لە بنەڕەتدا هەردوو دیاردەی کۆیلە و جاریە لە قورئاندا بنبڕکرابوو. چۆن دەرەبەگایەتی سەرچاوەکەی لە زەویداریە بە هەمان شێوەش کۆیلایەتی و جاریەباری بەرهەمی ستەمکاری و شەڕ و شۆڕ بوون...

بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوەیە تایبەتە بە هەبوونی کۆیلە و جاریەی ئایدیۆلۆژیا و لەزەت و ئابووری و سیاسی کە تیایندا جەستەی ئافرەت وەك باشترین کەرەسەی سێکسی بەکاردێن ، ئەم کارە لە حوکمڕانی کۆمۆنیستیدا لە سەر بنەمای چێژبەخشین و چێژوەرگرتن و ئایدیۆلۆژیا کاری لە سەر دەکرا ، لەولاوەش بەناوی ئازادی سێکسی و شەخسی لە چەندان فیلمی تەواو ڕووت ( پۆنۆگراف ) و نیمچە ڕووتی ئەوروپا ، بانگەشەکانی فێمینیستی ڕوو ڕەشتر کرد ، چونکە ئەو ئازادیانەی سەرەوە

لە سەر namووس و کەسایەتی ئافرەت دەکران وەك بڵێی ئافرەت لە ئەوروپا سەرچاوەی چێژفرۆشی و کەرامەت هەراجییە !

حوکمڕانی کۆمۆنیستی هەر پرۆسەیەکی سەقەتی حوکمڕانی نەبوو ، بەڵکو ئاکامەکانیشی جۆرێکی تر بوو لە بەرپاکردنی سێکس بە گوزەران ( ئابووری )،بۆیە دوای ڕوخانی ئەو حوکمڕانیە لە سۆڤیەت و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی ، شەپۆلێکی سۆزانی —قەحپەی ئابووری لە نۆوەدەکان ڕوویکردە تورکیا و ئەو وڵاتانەی دەوروبەری.

لە خودا داواکارم لەم پرۆژەیەدا سەرکەوتووم بکات

**سەلام ناوخۆش**
**چواردەی ڕەمەزانی ١٤٣٦**
**بەرانبەر یەکی تەموزی ٢٠١٥**

## دەروازەی ڕێخۆشکردن

## یا ناساندنی زاراوەکانی بوارەکە

لەم جۆرە دەروازەیەدا قسە لە سەر چەند چەمك و زاراوە و بابەتی تایبەت بە توێژینەوەکە دەکرێت وەك چەمکی کۆیلایەتی و کەنیزەك لە ئەوروپا و ئیسلام ، پێگەی ئافرەت لە دەقی قورئاندا ، قورئان و توراس ... ئایا هەموو ئەو تەفسیرانەی لە کوردستان هەن ، تەفسیری خودی قورئانە وەك دەقێکی ئیلاهی دوور لە هەژموون و کاریگەری کۆمەڵگا یا تەفسیری توراسی بارگەکراو بە قورئانن ، بۆیە دیارکردنی ژێدەری شوناس یەکێك لە ئارمانجەکانی ئەم توێژینەوەیە .

هەندێ زانیاری و چەمك و دیاردە هەن دوور و نزیك پەیوەندیان بەم توێژینەوەیە هەیە ، لەوانە :

### یەکەم ، کردنەوەی فایلەکە

شرۆڤەکردنی جیاوازی نێوان قورئان و توراسی ناکۆك

کردنەوەی ئەو فایلە هەتا هەشتاکانیش لە نێوان نووسینی کوردی کارێکی هێندەك بڤە بوو . ئەو بڤەبوونەش لە دوو هۆکار سەرچاوەی گرتبوو :

١. نەرێتی موتڵەقبوونی نیازی بکەر

زۆربەی ڕۆشنبیری دەرەوەی مزگەوت ، ڕۆشنبیرێکی چەپ و دووره دین بوو یان دین لای دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی مرۆکردە بوو

٢. بە دەگمەنبوونی نەرێتی نیاز

نووسینی هزری و فەلسەفی کوردی هیچی زادەی تێڕامان و هزری نووسەری کوردی سیکیولەر نییە ، بەڵکو تەرجومەی نەیاری ئیسلامە لە نەتەوەی هاوشێوە . ڕەوشی هەبوونی ئەو کتێبانە ، سەلمێنەری ڕاستی پرسەکەیە .

ئەم کتێبەی بەندە تەواو جوودایە لەو جۆرە کتێبانە . تەواو بریتیە لە لابردنی تارمایی و هەژموونی کەلتوور و توراس لە سەر دەق . کەلتوور و توراس و مێژوو بە پێوەری قورئان ، دین نیین بەڵکو ئەوەی حوکمە ئایینیەکانی لێ وەردەگیرێ خودی قورئان+سیرە+سونەیە.

قورئان دەقێکی ئیلاهی دەسکاری نەکراوە ، هەر لەو ڕوانگەوە سیرە دەپێوین . سیرە ، لەم دیتنەدا تەنیا ٢٣ ساڵ پێغەمبەرایەتی خۆشەویستە ، هەرچی فەرموودەیە کەم و زۆر دەستی مرۆڤی گەیشتووتێ ، بۆیە فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو و صحیح و متەواتر هەیە ...هەر لەو ڕوانگەوەشەوە دەرگا بە باش و خراپ لە سەر ناوە پیرۆزەکان کراوەتەوە لەوانە سەلەفیەت گێڕانەوەی بوخاری بە اصدق الحدیس دادەنێن کەچی تەیاری تر بوخاری بە تاوان دەبینن ، چونکە بەشێك لە فەرموودەکانی دژن بە گوتاری قورئان .

ئەوەی بەندە لەم ڕوانگەوە لە کۆمەڵی کوردی کردوویەتی مەتنی فەرموودەی بە پێوەری قورئان دیتووە ، نەك تەنیا گێڕانەوەی کەسەکان!

لەو ڕوانگەوە ساڵی ٢٠٠٩ کەوتمە وەرگێڕانی نامیلکەیەك لە ئینگلیزیەوە بە ناوی : ئایا عائیشە بووکێکی شەش ساڵان بوو ؟ وەرگێڕانی ئەو نامیلکەیە لەبەر دوو هۆ بوو :

١. نەگونجانی گوتاری فەرموودەکە لەگەڵ گوتاری قورئان

٢. بلاوبوونـەوەی فەرموودەکـە وەك ڕاسـتیەکی حاشـالێنەکراو لـە نێـو کۆمەڵگەی کوردیش!

ئـەوەی زانــراوە و ڕاسـتیە دایکمـان خەدیجـە کـە شـووی بـە پێغەمبەر کرد : ( بێوەژن ) بوو هەروەها ( تەمەنی چل ساڵان ) بـوو ، لە هەمووی گرینگتریش هەشت کوڕ و کچی لە پێغەمبەر بـوو ، ( چوار کوڕەکەی قاسم ، تەیب ، تاهر ، عبدالله ) لە تەمەنی مناڵی مردن!!

لێرەدا چەند خاڵێك لەو ڕاستیانە هەن کە تـەواو ئارگیومێنتی ( ٩ ساڵیی ) عائیشە هەڵدەوەشێننەوە :

١. بێوەژن –کچ بوون و گۆڕان لە جەستە دروست دەکەن

٢. تەمەنی ٤٠ ساڵیی لە نیوەدورگەی عەرەب

٣. دایکی ٨ مناڵ ، لە پاش تەمەنی ٥٠ ساڵیی منداڵبوون بۆ ژن نەستەمە

٤. جەرگسوتانی دایك بە مردنی نێرینەکانی!

نووسـەری کتـێبی ( لەگـەڵ پێغەمبـەران ) لـە لاپـەڕە ( ٦٥٥ ) بـۆ داکۆکیکردنی لە تەمەنی ( ٩ ساڵیی عائیشە ) پاڵپشتێکی کەلامی ( بـۆدلی ) ڕۆژهەلاتناس دەهێنێتەوە ، کە تـەواو جوودایـە لەگـەڵ ئـەو فاکتـەی سـەرەوە :" عائیشــە – وێــڕای بچــووکی و کــەمی تەمــەنیی ، بــەلام ئــافرەتێکی پێگەیشتوو و باڵغ بووە ، چونکە ئافرەتی عـەرەب لـەو سـەردەم و ژینگەیـەدا زوو پێدەگەیشتن و لە دوای بیست سـاڵیی و سـەرەتای سی سـاڵییانەوە بـەرەو پیربوون دەچوون ."

ئەو تێگەیشتنە پڕ ناکۆکیەی بۆدلی بۆتە ئارگیومێنتێکی قایلکەر لە نێو زۆربەی مەلای کورد ! با بەراوردێك لە نێوان تەمەنی ( خەدیجە ) و (عائیشە) بکەین ، بزانین چۆن نۆ ساڵ بووە :

١. خەدیجە و ئائیشە لە یەك ژینگە ( مەککەی پیرۆز ) گەورەبوونە : بە قسەی بۆدلی ئافرەتی مەککە لە ٣٠ ساڵی بەرەو پیربوون دەچێت ؛ ئەی خەدیجە کە شووی بە پێغەمبەر کرد ٤٠ ساڵ نەبوو ؟؟ ئەی چۆن بووە دایکی ٨ منداڵ؟؟

٢. خەدیجە هەتا مردیش شێرە ژن بوو ، لە هەموو مەینەتی و دەردەسەرییەکان پاڵپشتی پێغەمبەر بوو .

٣. فەرموودەی " خذوا شطر دینکم عن هذه الحميرا – نیوە دینەکەتان لەم سورکەڵەیە وەرگرن "

هاوسەرگیری عائیشە لە پاش سویدە و لە پێش ماریە شمعون قبتی بووە . سویدە زەمەنی کۆچ بۆ حەبەشە بووە ، ماریەش دوای صلحی حودەیبیە بووە وەك هاتووە :مەقوقس پاشای میصر لە وەلامی نامەی پێغەمبەر ماریەی میصری (قیبتی ) کە کچی یەکێك لە گەورە پیاوانی میصر بووە ، لە ساڵی ٧ی کۆچی خەلاتی پێغەمبەری کردووە چۆن سوڵتانی میتانی ، نیفیتیتی خەلاتی فیرعەونی میصر ( ئەخنات(ۆن ) کردووە . گەر دامانا مێژووی وتنی فەرموودەکە لە ٦ی کۆچی وترابێت ، کەواتە ٩+٦ =١٥ ساڵ ( تەمەنی عائیشە ) یا وەختی وەفاتی ١١ی کۆچی : ٩+١١=٢٠، ئایا دەکرێ موسڵمان (نیوەی دینی خۆی) لە ئافرەتێکی ١٥-٢٠ ساڵی یا ٢٥-٣٠ ساڵی وەرگرێت ؟؟!!

هەوڵی دووەمم ، کتێبی محمد و عیسا لە شیعری کوردی دا . لەم کتێبەدا بۆ یەکەمجار دەیان تێکستی شیعریم هێناوەتەوە کە ئەو مەسیحەی لە شیعری کوردی نوێ و هاوچەرخ حزووری هەیە ، مەسیحی ناو ئینجیلە نەك قورئان ! ئەو دیاردەش ئەوەدیاردەخات کە زۆربەی شیعری نوێی کوردی شیعرێکی ئایدیۆلۆژیە بە تامی مارکسی ، ئیلحادی ، زەردەشتی ! هەوڵی سێیەمم کتێبی ڕۆژئاواناسیە ، ئەوەش هەر یەکەمجارە کتێبێك بە کوردی لە سەر دیاردەی ڕۆژئاواناسی بلاّودەکرێتەوە ، لەمەشدا ئیسپاتی دەکەم کە زۆر حاڵەت و کەلتووری کوردی ئێستا بە هەمان فۆرمەوە لە ئەوروپا هەن ! کتێبی چوارەم " سەربردەی پێغەمبەرەکان ..."بوو . ئەم کتێبە دووجار چاپکرا ، جگە لە کورتە ژینامەی پێغەمبەرانی قورئان ، قسە لە سەر زۆر بابەتی هەستیار کراوە لەوانە کارەکتەری مەسیحی نێو ئینجیل عیسای ناو قورئان نییە! ، کتێبی پێنجەمم " خوێندنەوەیەکی پراگماتیکی قورئان " بوو ، کتێبی شەشەمم " زمانی قورئان .... " لەم کتێبەدا بۆ یەکەم جار قسە لە سەر ئەو چەند ئایەتەی قورئان دەکەم ، کە هەڵگری وشەی " عەرەبی " ن . لەم کتێبەدا لە ڕوانگەی تێکست و کۆنتێکستی قورئانەوە ئەوەم ئیسپاتکردووە کە ئەو عەرەبیە بۆ تێکستی قورئان دەگەڕێتەوە ، نەك نەتەوەی عەرەب . کتێبی حەوتەمم " تێکستی قورئان و مێژوو " بوو ، لە کۆمەڵگادا دیاردەی ئیسلامی مێژوویی هەیە ، کەچی لە قورئاندا ئیسلامی عەقیدەیی هەیە ، بوونی ئەو دوو جیاوازییە ، ئەوەی هەیە ئیسلامیەکە زیاتر بە تامی مێژوو و توراس و ئایدیۆلۆژیایە.

لە کتێبی هەشتەمدا کە بە ناوی سیکیولەری کورد و قورئان قسە لە سەر ئەوە دەکەم کە ئەوەی سیکیولەری کورد دەربارەی قورئان دەڵێن تەقلیدی تەقلیدە ، یەکەمجار ڕۆژهەلاّتناسەکان و دووەم جار سیکیولەری

عـەرەب و فـارس ، سـیکیولەری کـوردیش بەرهـەمی ئـەو سـیکیولەرانەی گواستۆتەوە.

کتـێبی ئەفسانەکانی سـیکیولەری کـوردی کتـێبی نۆیـەمی ئـەو بـوارە پێکـدێنێ . ئەفسـانەی پێسـتەکە ئەفسـانەی بـەرایی سـیکیولەری کـوردە هـەروەها زۆر بـە نـاڕەوا قسـەیان لـە سـەر کارەکتـەری ئیسـلامی وەك سەلاحەدین و ئیبن خەلەکان و نورسی کردووە.

ئەم کتێبەشم ، کە کتێبی دەیەمە لە سەر چەمکی قورئـان و تـوراس بۆ تاوتوێکردنی پرسی کەنیزەك ، مولکی یـەمین یـا مـا ملکت ــە لـە نێـوان قورئان و توراس دا ! بە گوێرەی قورئان دەقێك لە قورئـان نییـە جـەخت لـە سـەر هـەبوونی کـەنیزەك بـە واتـای جاریـە لـە کۆمـەڵگای قورئـانی بکـات ، کەچی توراسی عەرەبی و تورکی کە بە حوکمڕانی ئیسلامی نـاوزەد دەکـرێن ماوە نا ماوە پڕیەتی لـە جاریـە یـا حـەرەمی کۆشـك ناسـراو بـە حەرەمسـەرا ناسراو !

کتێبی یازدەمم کتێبێکە بە ناوی خودا و سیستەمی ستەمکاری مـرۆڤ . لەو کتێبەدا دەمەوێ بڵێم لە (دنیادا) لە سـەر پرسـی بـاوەڕبوون و نـەبوون دادوەری لە نێوان مرۆڤەکان ناکات ، چونکە نە موسڵمانبوون منەتبارییە بە سەر زاتی خودا ، نە سەرکێشی و کەللە ڕەقـی بێبـاوەڕ . خـودا هـەر خودایـە تۆ موسڵمان بێ یا بێباوەڕ ، بۆیە فیرعەونە کۆن و نوێیـەکان لـە سـەر سـتەم لە مـرۆڤ لـە دنیـا نغـرۆ دەکـرێن ، لـە دنیایەکـەی تـریش بـە جەهەنـەم شـاد دەکرێن .

لـە هـەر (۱۱ )کتێـب بەرگریـەکی بێوچـان لـە دەقـی ئیلاهـی قورئـان دەکـەم ، بـێ ئـەوەی لـە جـوغزی سـیرە دەربچـم ، لـەم پرۆسـەیە تەئکیـدی دەکەمـەوە کـە دەبێـت ڕاسـتی و نـا ڕاسـتی ڕووداوی نـاو مێـژوو ، دەبـێ بـە پێوەری قورئان شرۆڤەبکرێت ، نەك مرۆڤکردە .

## دووەم ، حزوری هەژموونی ئایدیۆلۆژیا لە پرسەکە

گومان لەوەدا نییـە کـە کۆمـەڵگای عـەرەبی جاهیلی و ساسانی فارسـی جمەی دەهات لە دیاردەی کەنیزەك و جاریـە . لـەو دوو کۆمەڵگایـە جگـە لـە کـەنیزەکی قەصـری سـەرۆك ، بـازاری سێکسـی بـۆ عـەوام خـانووی تایبـەت و ئالای تایبەتی هەبوو .

لە وڵاتی ئیران دا بزوتنـەوەیەکی وەك مەزدەکی هەبوو ، کە بـە ئاشـکرا بانگەشەی بۆ مەشاعەکردنی سێکسی دەکرد ، لە لایەکی دیش کۆشك پـڕ بـوو لـە کـەنیزەك ، هـەر بـۆ نموونـە خەسـرەوی دووەم زیـاتر لـە ٣٠٠٠ کـەنیزەکی هـەبوو یـەکێ لەوانـە شـیرینی مەسـیحی بـوو( لـە کوردیـدا داسـتانی دڵـداری خەسـرە و شـیرین بـە ناوبانگـە )، بۆیـە ئـەوەی ئـەوروپا و سـیکیولەری کـورد قسەی لـە سـەر دەکـەن مەسـەلەکە پەیوەسـت نییـە بـە پرسـی ئینسـانیبوونی نافرەت ، بەڵکو سیاسـەتی چەواشـەکردنە ، ئەگـەرنا خـودی ئەوروپیـەکان لـە سەر کتێبـێکن کـە بـاس لـەوە دەکـات سلێمان ناوێـك ١٠٠٠ ژنـی هـەبووە ، ٣٠٠ کـەنیزەك بـوون !! فێمینیسـتی کـوردیش بـاس لـە خەفـەکردنی سێکسـی لای لاوی کورد دەکات بۆیە بەرەو ڕۆژئاوا دەچێت!!

ئەوە پرسی ئەم کتێبە نییە .

لە پرسی وروژاندن و تێکەڵکردنی جاریە و موڵکی یـەمین دەگەڕێتـەوە بـۆ حـزووری ئایـدیۆلۆژیای سیاسـی نـەك بـاوەڕ ، بۆیـە لـەم پرسـەدا کـار بـە ئایدیۆلۆژیا دەکات ، نەك باوەڕ .

ئایدیۆلۆژیا و دەبـەنگیی دوو جمکـی پێکەوە گرێـدراوی ڕۆژگـارن .بـۆ ئەوەی وێنەکە تەواو ڕوون و سازگار بی لای خوێنەری زینـدوو ، نـەك مـردوو و گێرەشێوێن ، پێناسەی هەردوو چەمکەکە دەکەین :

ئایـــدیۆلۆژیا دوو واتـــای بنـــەڕەتی لـــە خـــۆ دەگرێـــت . فەرهـــەنگی ئۆکسفۆرد ٢٠١٠ لـە لاپـەڕە ( ٧٧١ ) ئـەو دوو واتایـەی ئایـدیۆلۆژی ئـاوا بـاس دەکات :

١. بریتیە لەو کۆمەڵە بیرۆکەی کە سیستەمی ئـابووری یـا سیاسـی لـە سـەر دامەزراوە ، وەك ئایدیۆلۆژی مارکسی یا ئایدیۆلۆژی سەرمایەداریی .

٢. بریتیە لەو کۆمەڵە باوەڕەی بە تایبـەتی ئـەوەی لای گروپێکـی دیـارکراو و تایبـەت تەبـەنی دەکـرێ کـە کاریگـەری لـە سـەر شـێوازی ڕەفتـاری خەڵك هەیە ."

لە بەرانبەر وشەکە ، وشەی بیلیف هەیە کە واتای سـەرەکی بریتیـە لـە بڕوای ئایینی تاك .

ئـەوەی لـە باشـووری کوردسـتان دەگوزەرێـت هـەژموونی ئایدیۆلۆژیایـە نـەك بـاوەڕ ، بۆیـە هـەر لـە نێـو کۆمـەڵگای کـوردی چـەندەها حیزبـی یـەك باوەڕی وەك ئیسلامی هەن ، بـە واتایـەکی دی ئـەوەی دوو حیزبـی ئیسـلامی لە کۆمەڵگا جیا دەکاتەوە ، ئایدیۆلۆژیایە نەك بـاوەڕ . لـە کودەتـای سیاسـی و هـــزری و عەســـکەری سیســـی لـــە میصـــردا ، ئیخـــوان و ســـەلەفی لـــە یـــەك جیابوونـــەوە کەچـــی هـــەردووك بانگەشـــەی یـــەك بـــاوەڕی دەکـــەن ئـــەویش باوەڕی یەك خودایی و یەك قورئانیە!

ئایـدیۆلۆژیا دۆگمـایی وەبەرهـەم دەهێنێـت ، ئەوەتـە حیزبـی چـەپی کوردی ئەوە زیاتر لە نیو سەدەیە بە نـاوی " زیـاتر مارکسـیبوون " بوونەتـە هۆکاری ئینشقاقبوون و تـاغتبوون —تـاکڕەوی ، بـۆ نموونـە بڕوانـە دیـاردەی حیزبەکانی هەر چوار پارچەی کوردستان. لەوبارەیەوە گوسـتاڤ لـی بـون ١٨٩٦ لـە کتـێبی (جـەماوەر) بـاس لـەوە دەکـات کـە جـەماوەرێکی مێگـەلی لـە نێـو

ئایدیۆلۆژیا دەژی ، کە بە ماستیش دەڵێت ڕەش ! ئەو دیاردەیە سەیر نییە لە شەرقی ئەوسەت ، بۆ نموونە گەر لە مۆسکۆ باران باریبا ئەوان لە کوردستان و عیراق ....چەتریان هەڵدەدا! ئەو خەتەرە داعشە سیکیولەرە نووستووەکانی بە ئاگا هێنا بۆ ئەوەی بەو پەری دەمارگیری و پەرگیری بەر بینە پرانسیپەکانی ئیسلام ...وەك بڵێی ئیسلام هۆکاری سایکس بیکۆ و لۆزان وئەو هەموو ئینشقاقە لێواو لێوە و گەندەڵیە بێت. ئەو ئەمریکایەی ئەمڕۆ لە تۆی دەبەنگی نووستووی ناو ئایدیۆلۆژیا بۆتە مۆسکۆ ، هەر ئەو داعشی دروست کرد . ئەو داعشە بە گوللە کوڕی کورد بێ ڕەحمانە دەکوژێت ...ئەی ئەو حیزبە کوردیەی سەرچاوەی قووتی خەڵك دەتەقێنێتەوە و دوایێ دەڵێ نەمزانی ! ئەوەی مالیکی و عەبادی پێی نەکرا ئەوان خەریکە دەیکەن ، ناوی بنێین چی ؟

لە نەزەر ئایدیۆلۆژیا هەر یەك لەمانە شوناسێکی هەیە ، داعش تیرۆریستە ، مالیکی و عەبادی هەڵگری ڕقی مەزهەبی و قەومین، ئەوەی پەکەکە دەیکا بەرگری لە خۆ کردنە. توخوا ئەوە دەبەنگی ئایدیۆلۆژیا نییە لە ژێدەری قووتی خەڵك بدەی و بێیە سەر جادە شاباشی کاری وابکەی هوتافی بۆ لێبدەی ؟ ئێستا من موسلمانم دژ بە هەموو کارێکی نائینسانی حەماس و ئیخوان و سەلەفی و داعشم دژ بە کورد و غەیری کورد دەوەستمەوە ، دەزانی بۆ ؟چونکە خۆم بە زیندووی ناو باوەڕ دەزانم هەر ئەویش ئاراستەم دەکا نەك دەبەنگێکی نووستووی ناو ئایدیۆلۆژیا .

پرسی تێکەڵکردنی جاریە و مولکی یەمین چۆن بەرهەمی توراسە ئاوا بەرهەمی ئایدیۆلۆژیایە بە تایبەتی ئایدیۆلۆژیای چەپ و یەهود .

## سێیەم ، موحەمەد شەحرور و توراس

شەحرور جیا لە زۆربەی بیرمەندی ئیسلامی مامەڵەی لەگەڵ توراس ، کەلتوور کردووە . هۆی سەرەکی قەبوڵنەکردنی تێڕوینەکانی شەحرور لە بەر چەند هۆیەکە :

١. مانەوەی ماوەیەکی زۆر لە ژێر حوکمڕانی شیوعیەت لە سۆڤیەت مایەوە هەتا هەرەسی ئەو حوکمڕانیە ئایدیۆلۆژیە ئەنتی -دینیە، بۆیە بە مارکسی تۆمەتبار دەکرا ، بۆ نموونە عبدالرحمن الميداني لە کتێبی " التحريف المعاصر " دا یەکلایدەکاتەوە کە شەحرور بە بیرکردنەوە و میتۆدێکی مارکسی ،کە لە سەر ماتریالیزم دامەزراوە ، شرۆڤەی قورئان بە هەوەسی خۆی دەکات.

٢. وروژاندنی پرسی توراس لە کۆمەڵگای عەرەبی ، ئەو کۆمەڵگایەش زیاتر لە سەر ئیسلامی ناو مێژوو و توراس و کەلتوور دامەزراوە ، نەك عەقیدە.

٣. گومان لەو باکگراوەندە کەلتووری و ئایدیۆلۆژیە

وێڕای ئەو مێژووە ئایدیۆلۆژی و کەلتووریە ، شەحرور سنووری زۆر پرس دەبڕێت ، لەوانە :

١. یەکسانکردنی سیرەی نەبەوی بە توڕاس

گومانی دکتۆر شەحرور لە فەرموودە وایلێکردووە جورئەتی ئەوە دەکات قسە لە سەر بەستنەوەی سیرە بە عورفی عەرەبی . ئەو وتنە سیکیولەری عەرەب جورئەتی نەکردووە بیڵێ . بۆیە لە پرسی هەبوونی وەلی ئەمر لە هاوسەرگیریی و نەبوونی لە سیرەدا مەسەلەکەی ئاوەژوو کردۆتەوە :

" ومن اعراف العرب التي تحولت إلى سنة نبوية "

٢. حیجاب و مێشك داپۆشین

حیجـاب – بـالاّ پۆشی و سەرپۆشی شوناسـی ئـافرەتی موسـڵمانە . شەحرور هێندێ سەرچاوە دەکاتە پاڵپشتی پرۆپۆزەلەکەی ، لەوانە

١. بالاّپۆشی پەیوەندی بە بەردبەندی هزری هەیە

٢. عادەتێکی جوولەکەیە

لەمـەدا قسـەی ناصر ئـەبو زێـد دەهێنێتـەوە . وقـد تطـرق د. نصـر حامد ابو زيد لهذه المسالة، وراى ان الحجاب الخارجي للمـراة - اي تغطيـة الجسـد والـراس - هـو تجسـيد رمـزي لكـل معـاني التغطيـة العقليـة والاجتماعيـة لهـا." لای ئـەبو زێـد حیجـاب داپۆشـینی جەسـتە و سـەر نییە ، بەڵکو داپۆشینی عەقڵ و عەقڵیەت ..."- ه .

ئەو قسەیەی ئـەبو زێـد قسـەیەکی مسقۆف و متەنـەورەکانی کـوردم دێنێتەوە بیر کە لە بارەی " جەبەدان "ی شوناسی کـوردی دەیـانگوت : " ئەو جەبەدانیە هەر سەری پیـاوی کوردی دانەپۆشیوە ، بـەڵکو مـانع التفكير ( ڕێگری بیرکردنەوەیە ) ، هـەر لـە ئـەو بنیاتـەش پیـاوی کـورد بەوانـەیان دەوت : سەر ڕووت ، کە هیـچ بەهایەکی کۆمەڵایـەتیان نـەبوو ، قسـەکەی ئـەبو زێـد و نــەوال و فاتمـە ڕێیسـی و سـەلامە موسـا و شەحرور دەربارەی حیجاب هیچ بەهایەکی نییە !

٣. بۆندی هاوسەرگیریی

بە پێچەوانەی کۆمەڵگا ، شەحرور وەلی ئەمر لە هاوسـەرگیریی دا بـە شـێوەیەکی توراسـی دەزانێـت . لێـرەدا گـەر وەلـی ئـەمر نـەبێت ، ئایـا کۆمەڵگای عەرەبی وەك کۆمەڵگای غەربی لێنایەت ؟؟

ئـەوەی شـەحرور دەیکـا ، دابـڕینی قورئانـە لـە سـیرە و فـەرموودە و تـوراس . نووسـینەکەی مـن بـە هـیچ جـۆرێ بـە پێـی دیـتنی شـەحروری نەنووسـراوە ، بـەڵکو تـەنیا خوێنـدنـەوە و لـە بێژینگـدانی توراسـە ، نـەك سیرە بە پێوەری قورئانی .

سـەیرم لـەوە دێـت هێنـدێ دەقـی قورئـان بـە دەقێکـی پاسـیف ، نـەك ئاکتیف دەبینن . لەم چەرخەدا کە ئامێرەکانی ئای تی لە خزمەت دەقـدان ، پرسـی مـولکی یـەمین بـە سـەبایا و کـەنیزەك ڕاڤـە دەکـەن ، ئـاخر سوڕمتێك مەکی بێت چۆن مـولکی یـەمین بـە ئەسیر و بەنـد و کـەنیزەکی جەنگ دێت؟؟؟ ئاخر لە ١٣ ساڵی مەککەدا ئەسـیری چـی ، جاریـەی چـی ؟ موسڵمان قوژبنێك نەبوو خۆی تێدا حەشار بدا؟؟

ئەو تەسـککردنەوەی دەقـی قورئـان لـە پـای چـی ؟ دیـتنی مارکسـی بـۆ قورئان بریتیە لە بە ماددی — مەتریالی دیتنی شتەکانی ناو قورئـان ! ئـەم قورئانـە باسـی هەنـدەسـەی جینـات ، هەنـدەسـەی بوونـەوەر و گـەردوون ، هەنـدەسەی ڕزق ....دەکـات ، نـەك کەمکردنـەوەی مـەنزڵی مێینـە و مـیرات .... بۆیە ئـەم کـارەی ئێمـە بـە قـەدەر دووری ئاسمـان و ڕێسمان لـە دیـتنی شـەحرور بـۆ تـوراس دوورە ، ئایـدیۆلۆژیا و هەڵوەشـاندنەوە لـە پشـت دیتنەکـەی شـەحرور بـە نهێنی خـۆی مـەلاس داوە ، هەرچـی ئـەم کارەیـە هەوڵدەدا تارمایی توراس لە سەر دەق لابدات.

کارەکتـەری ئـەم مەیدانـە زۆرن لـە نێـو شـەهادەدارەکان وەك دکتـۆر حەسەن حەنەفی ....، بەڵام ئامازەدان بە شەحرور بۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە کەسانێك لە باشووری کوردستان هـەن ، خۆیـان بـە شـەحروری دەناسـێنن ،کـە لـە ڕواڵـەتی ئـەفکارەکانی شـەحرور گەیشـتوون بـەوەی تـوراس هەژموونی بە سەر زۆر بوارەکانی ئیسلام داگرتووە.

## چوارەم ، توراس لە نێوان قەبووڵ و ڕەتکردنەوە دا

دوو وشە بە مانای جیاواز لە نێوان قورئان و کۆمەڵگەدا هەن ، ئەویش وشەی توراس و عورفە ، لە سوڕەتی الفجر توراس بە مانای ﴿وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلاً لَّمّاً﴾ بە واتای " خواردنی ماڵی میرات بە ناهەقی " یا خواردنی ماڵی کەسانی دی دێت لە میرات .وشەیەکی دی هەوڵدەدا شوێنی توراس بگرێتەوە ئەویش وشەی " عورف " ـە، لە لاپەڕە ٣٢٣ ی فەرهەنگی ئەلونجید دەربارەی عرف هاتووە : " زانی ، ناسی " هەروەها لە ئایەتی ١٩٩ی سوڕەتی الاعراف دەربارەی ئەلعورف هاتووە :" و أمر بالعرف..." لە سەردەمی لێکدانەوەی وشە بە ڕواڵەتەکەیەوە تەبەری و ئەلسیوتی ... وشەی عورف بە چاکە تێدەگەن .هەژار موکریانی لە لاپەڕە ١٧٦ دەربارەی ئایەتەکە دەنووسێ :" فەرمان بە کاری چاك بدە..." هەروەها عەبدولکەریم مودەریس لە ل١٧٦ دا ئایەتەکە بە " ئەمر بە چاکە بکە..." ڕاڤە دەکا .

ناسیۆنالیستی عەرەبی دەربارەی ئەو دوو وشەیە هزری دی هەیە : توراس کۆنینە ، کەلەپور ، عورفیش داب و نەریتی نەتەوەیە . لە کۆمەڵگای عەرەبی و کوردی...توراس و عورف و کەلتوور ، چونکە پەیوەستن بە ڕابردووی نەتەوە، بۆیە شوێنەوار و کاریگەری لە دەق زیاترە . ئەم توراس و عورف و کەلتوورە تارمایی بە سەر تأویلی قورئان دیارە.

زۆربەی ئەو دینەی لە کۆمەڵگا هەیە ، ئیسلامێکی مێژوویی یا ئیسلامی ناو مێژوو و توراسە ، نەك ئیسلامێکی عەقیدەیی !

لەو هەموو سەین و بەینەدا ئیشکالیەتی مەنهەج لە شروڤەکردنی توراس دروست دەبێت : مەنهەجێك قەبوولی توراسەکە دەکات وەك زۆربەی تەفسیرە کوردیەکان ، مەنهەجێك بە میتۆدێکی تأویلی شرۆڤەی ئەو توراسە دوور لە سیرە و فەرموودە دەکات هەتا کەسی وەك ئاراگۆن و ئەبو زێد و شەحرور خودی عورفەکە بە سیرەی نەبەوی تێدەگەن . میتۆدێکی تر هەیە ئەو توراس و کەلتوورە بە پێوەری قورئان لە بێژینگ دەدات ، ئەو لایەی توراس قەبوولْ دەکا کە لەگەلْ گوتار و تێکستی قورئان دێتەوە هەروەها ئەو لایەی توراس ڕەتدەکاتەوە کە لەگەلْ قورئان تێکناکاتەوە!

## پێنجەم ، توراس و ناسیۆنالیزمی عەرەبی و ناسیۆنالیزمی کوردی

ناسیۆنالیزمی عەرەبی قەومیە بە تامی " ئیسلامی " ، هەرچی ناسیۆنالیزمی کوردیە عەلمانیە بە تامی چەپی مارکسی ! قورئان سەرچاوەی هزری هیچ ناسیۆنالیزمێك نییە ، چونکە پێوەری پەسەندی لە گوتاری قورئانی دا بە تەقوابوونە ، نەك جۆری نەتەوە.

بۆ یەکلاکردنەوەی شوناسی ناسیۆنالیزمی عەرەبی ، ڕەوتێك بە تامی ئیسلامی ، مارکسی هەتا نەصرانی و جوویی لە نێو توراس دەبینین ! کەواتە ئەو توراسە بێ گیانە لە کاتی تەنگانەدا کار لە سەر گوتاری دینی دەکات . بە قسەی ئیسلامیەکی کوردی هەتا لە نێو ئیسلامی عەرەبیش نەتەوە و خەونی عروبە و سوننەی سیاسی دەژیت . زۆربەی ڕەوتە عەرەبیەکان ناتوانن لە توراس جیاببنەوە ، چونکە توراس شوناسێکی ساختە بە بزاڤەکە دەدا هەروەها کەناڵێکی تەبشیری قەومیە بۆ عەوامی عەرەبی و نەتەوەی دی!

سەبارەت بە کورد ، عەرەبی سوریا و عیراق ئەوە نزیکەی سەدەیەکە خاکی کوردیان داگیرکردووە ، کەواتە ناسیۆنالیزمی عەرەبی بێشکچی وتەنی ڕەوتێکی ئیستیعماری نامێزە، چونکە بەشێك لەخاکی کوردی داگیرکردووە.

هەندێ توێژەری کوردی باوەڕیان وایە لە کوردستان ناسیۆنالیستی کوردی هەیە ، بەڵام هێشتا ناسیۆنالیزمی کوردی تەواو فۆرمەلە نەبووە . ئەو ناسیۆنالیزمە یا زەردەشتی یا مارکسی یا میللیە .

بالە میللیەکەی ئەو ناسیۆنالیزمە مەزهەبی بوو ، بەڵام ناسیۆنالیزمی دوای بزاڤە مەزهەبیەکە ڕەوتێکی زەردەشتی یا مارکسی بوو تەواو دوور بوو لە خۆ بەستنەوە بە توراس !

کەواتە لە کورتەی قسان دا ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە پەنا عەرەب پەسەندی ، توراس لە گوتاری خۆی تەوزیف دەکات ، بەلام ناسیۆنالیزمی کوردی تەواو خۆی دابڕیوە لە توڕاس .

لە پرسی مولکی یەمینیش دا ، ناسیۆنالیزمی عەرەبی پێی خۆشە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جاریە و کۆیلە ، بۆیە مولکی یەمینی قورئان بە جاریەی شەرعی دەبینی هەرچی ناسیۆنالیزمی سیکیولەری کوردیە تەواوی مێژووی عەرەب بە بازاڕی عوکاز دەبینی کە لە کۆیلە و جاریە نابڕێت !

* * *

## شەشەم ، ڕاڤەی قورئان یا ڕاڤەی توراس؟؟

هەژموونی ناسیۆنالیزمی عەرەبی زۆر بە زەقی لە توراسی عەرەبی دیارە . لە توراسی عەرەبیدا لە پرسی قوربانی ئیبراهیم پێغەمبەردا ، قوربانیەکە بە ئیسماعیل شرۆڤە کراوە ! لە توراسی عەرەبیدا ئیسماعیل پێغەمبەر باوکی پێغەمبەرانی عەرەبە ، کەچی ئیسحاق پێغەمبەری کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر لە ساراوە باوکی پێغەمبەرانی جولەکەیە . لەو بەینەدا لە کاتی پرسی قوربانیدا توراسی عەرەبی ئیسماعیل پێغەمبەر دەهێنێتە پێشەوە . دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی لە دووەم جەژنی قوربانی ٢٠١٥ دا باسی لەوە کرد کە چەندان صەحابەی وەك عومەری کوڕی خەتاب و ئیبن عەباس و کوڕی عومەر ...و چەندان تابعین قوربانیەکە بە ئیسحاق دەبینن!!

لێرەدا بۆت دەردەکەوێ کە ناسیۆنالیزمی عەرەبی چۆن هەژموونی لە نێو توراس هەیە ، تەفزیلکردنی ئیسماعیل وەك باوکی پێغەمبەری عەرەبی نەك هەر لە نێو عەرەب پیرۆز و جەختی لە سەرکراوەتەوە بەڵکو گواستراوەتەوە ناو توراسی کوردی دینی .

خودا لە قورئاندا لە پرسی قوربانیدا ئاماژە تەنیا بە ئیبراهیم پێغەمبەر دەکات ، قسە لە سەر شوناسی هەردوو کوڕەکەی ، ئیسماعیل ( باوکی پێغەمبەرانی عەرەب ) و ئیسحاق ( باوکی پێغەمبەرانی جولەکە ) ناکات ، کەواتە ئەوەی هەیە لە کۆمەڵگای عەرەبی و کوردی ئیسماعیل پێغەمبەرە ، نەك ئیسحاق پێغەمبەر . پاش ٣٥ساڵ لە گوێگرتن لە خوتبەی مەلای کوردی یەکەمجارە گوێم لە خوتبەیەکی مەلای کوردی بێت ، باس لەوە بکات کە شوناسی قوربانیەکە مەسەلەیەکی خیلافیە . قورئان ڕاستەوخۆ قسەی لە شوناسی قوربانیەکە نەکردووە ، چونکە لای خودا

ئـەوەی گرینگـە قوربانیەکەیـە ، نـەك شوناسـی قوربانیەکـە ! ناسیونالیسـتی عەرەبی ئەم پرسە خیلافیەی بە لای توراسی عەرەبی شکاندۆتەوە!

ئایەتی قوربانی تەنیا هەندێکە لـە زۆر حاڵەت کە بـە چاوی توراسی عـەرەبی شـرۆڤەکراوە ، نـەك قورئـان خـۆی . ئـەم حاڵەتـە توراسـیە هـەر بەردەوام بوو هەتا سەدەی نۆزدە و بیستەمیش ئیسلامی میللی و ئیسلامی مێـژوویی و توراسـی هـەژموونی بەسـەر بیرکردنـەوە و جومگـەکانی کۆمـەڵگا هەبوو . جگە لە هەر سێ هەوڵی مـەلای گـەورەی کۆیـە و موحەمـەدی خـاڵی سلێمانی و مەلا سەعیدی نورسی باکووری کوردسـتان هـەوڵێکی بوژاندنـەوەی هزری ئیسلامی نەبوو .

لـەو ڕەوشـەدا وەرگـرتنی کـەلتووری عـەرەبی وەك بەشـێك لـە ئیسـلام دیاردەیەکی ئاسایی بوو ، چونکە عـەقڵی شـرۆڤەکاری لـە نێـو کـورددا غائیـب یا دەگمـەن بـوو .کەلەکەبوونی ئـەو توراسـە نـامۆ بـە قورئانـە هـەر لـە نێـو عـەوامی کـورد نـەبوو ، بـەڵکو کـەم و زۆر پـەڕیبووە نـاو ڕاڤـەی قورئـان بـە کوردی !

لـە پرسـی مـولکی یـەمین لـە قورئانـدا ، بـێ ڕەچـاوکردنی کۆنتێکستی قورئـان و گوتـاری قورئـان ، ئـەوەی لـە توراسـی نیمچـە دوورگـەی عـەرەبی دەربارەی ئەم کەیسە هەیە ، ڕێك گۆستراوەتەوە ناو ڕاڤەی قورئان .

ڕاڤەی قورئان بریتیە لە دیتن و شرۆڤەکردنێکی دەقێکی ئیلاهـی ، بـۆ ئـەوەی بـۆ کۆمـەڵگا شـۆڕبکرێتەوە و مرۆڤـی موسـلمان و غـەیرە موسـلمان سوود مەنـد بـن تێیـدا . لـە تـوراس دا شـەپۆلێکی پارادۆکسی لەگـەڵ قورئـان حزووری هەیە ، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکاتـە دوو بەشـەوە هـەروەها خـودی موسلمانیش دەکاتـە شـیعە ، سـوننە ، سـەلەف ، خەلـەف ...کەچـی لـە گوتـاری قورئاندا شوناسی " موسلمان " شوناسێکی قورئانیە بۆ بەنـدەی تەسـلیم بـوو بە ویستی خودا ، بۆیە لە دیتنی شتەکاندا هیچ نەتەومیەك حزووری نییە!

# بازاڕی کۆیلە فرۆشتن - The Slave Market

## چەمکی کۆیلایەتی :

کۆیلایەتی دوو جۆری هەیە : کۆیلایەتی بۆ خودا و کۆیلایەتی بۆ مرۆڤ . ئیبن تەیمیە باوەڕی وایە کۆیلایەتی پەیوەستە بە دڵەوە .ئەو زات بچووککردنەوە و گوێڕایەڵیەی بەندە بەرانبەر بە زاتی خودا هەروەها بەندە ماڵ و نەفس و چارەنووس ...بە موڵکی خودا دەزانێت .

هەرچی کۆیلایەتی جۆری دووەمە ملکەچبوونی مرۆڤانێکە بۆ ئاغاکەی . لە لاپەڕە ١٤٤٦ ی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد دەربارەی کۆیلایەتی هاتووە : بە ئینگلیزی بە وشەکە دەڵێن slavery کە بریتیە لە هەبوونی فرۆشتنی کۆیلە لە بازاڕی کۆیلایەتی هەروەها بریتیە لە پراکتیسەکردنی پرۆسەی هەبوونی کۆیلە."

## چەمکی کەنیزەك :

زۆر پێناسە بۆ وشەی کەنیزەك کراون . وشەکە لە بنەڕەتدا لە کەنیز-ی فارسی وەرگیراوە . لەو هەموو فەرهەنگە کوردی و فارسیە دا دەردەکەوێ کە ئافرەتی کەنیز ئازاد نییە ، بەڵکو کارەکەرە .

شێخ موحەممەدی خاڵ لە ل٣٨٥ی چاپی ئاراس دەربارەی سینۆنیمی کەنیزەك دەنووسێت کارەکەر ، گیو موکریانی لە ل٧٥٧ ی فەرهەنگی کوردستان دەنووسێت : کەنیزەك یانی کەنیز ، کارەکەر ،کڵفەت ، قەرەواش هەروەها هەژار موکریانی لە ل٦٧١ی هەنبانە بۆرینە دا دەربارەی کەنیزەك

دەنووسێت : کەنیز قەرەواش خدامە ژنی بە پارەکڕدراو ، ماجد مردووخ روحانی لە ١١١٥ی فەرهەنگی فارسی –کوردی دانشگای کوردستان دەنووسێت : کەنیزەك لە وشەی کنیزی فارسی وەرگیراوە بە واتای کەنیز ، کەنیزە ، کەنووژ ،کۆلا ، ژن یا کچێك کە کۆیلەیە."

هیچ قامووسێك لەو قامووسانە وشەی کەنیزەك نابەستێتەوە بە سێکس و سێکسی ئازاد ، کەواتە کەنیزەك زۆر نزیکە لە دیاردەی مولکی یەمین !

کەنیزەك یا مولکی یەمێن تەواو دوور بووە لە جاریەبوون و کەرەستەی دەستگەرمکردنەوە ، بەڵکو لە زۆر بواردا بۆتە مامۆستای چەندان پیاوی ناوداری ئیسلامی ، عەبدالمەقسوود ٢٠١١، ل٩٨ ئەملوقری دەگوازێتەوە کە کەنیزەی " موتریف " لە مەولای خۆی زانستی ڕێزمانی عەرەبی-نەحو –فیقهی ئیسلامی فێر بوو .....تاکو بوو بە زانایێکی بەناوبانگ لە عروزی شیعردا ، دواتر ناوی بە العروچیە-عەروزناس دەرکرد، کۆمەڵێك زانا هەردوو کتێبی پڕ بایەخی الکامل ی موبەڕید و النوادری قالی یان لە لا خوێندووە."

هەرچی دیاردەی هەبوونی جاریە و حەرەمسەرایە هەڵگری واتای سێکس و سێکسی ناو کۆشکن . سۆزانیش بە پێچەوانەی جاریە و حەرەمسەراوە دەلالەتە بۆ سێکسی مەشاعی بە تایبەتی رەعیەت-ڕەشۆکی کە عائیشەی کچی ئەبوبەکر دەڵێت : ئەو پەیوەندیە سێکسیە هەتا هاتنی ئیسلام بەردەوام بوو هەروەها ئەو سۆزانیانە خاوەن ئاڵای خۆیان بوون .

## مێژووی کۆیلایەتی یا لە ئینسانکردنی مرۆڤ ؟؟

گەر بمانەوێت مێژوویێك بۆ کۆیلایەتی دابنێین ، ئەوا زوو ڕەنج بە خەسار دەبین ، چونکە کۆیلایەتی لە سەردەمی فیرعەونەکانی میصریش هەبووە هەروەها خودی شارستانیەتی میصری گەر بەرهەمی مرۆ عیملاقەکانی قەومی عاد نەبێت ئەوا بەرهەمی ڕەنج و خوێنی کۆیلەکانە!

ویل دیورانت لە چیرۆکی حەزارەت کۆیلایەتی بە گواستنەوە لە قۆناغی ڕاو و شکار بۆ قۆناغی کشتوکاڵ دەبەستێتەوە . لە لایەکی دی لە هەردوو پەیمانی کۆن –تەورات و پەیمانی نوێ –ئینجیل ئاماژە بە دیاردەی کۆیلایەتی و جاریە کراوە ، کەواتە کۆیلایەتی مێژوویێکی کۆنی هەیە و هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە ، بۆ نموونە بڕوانە الإصحاح ٢١ لە سفری خروج ٢-١٢ : (إذا اشتريت عبداً عبرانياً فست سنين يخدم، وفي السابعة يخرج حراً مجاناً، إن دخل وحده، فوحده يخرج، إن كان بعل امرأة تخرج امرأته معه ، إن أعطاه سيده امرأة وولدت له بنين وبنات فالمرأة وأولادها يكونون للسيد، وهو يخرج وحده، ولكن إذا قال العبد: أحب سيدي وامرأتي وأولادي لا أخرج حراً، يقدمه سيده إلى الله، ويقربه إلى الباب أو إلى القائمة، ويثقب سيده أذنه بالمثقب يخدمه إلى الأبد) هەروەها ئینجیلی نەصرانیەکان بڕوانە

الإصحاح شەشەم (٥-٩): (أيها العبيد، أطيعوا سادتكم حسب الجسد بخوف ورعدة في بساطة قلوبكم كما للمسيح، لا بخدمة العين كمن يرضى الناس، بل كعبيد المسيح، عاملين مشيئة الله من القلب، خادمين بنية صالحة كما للرب ليس للناس، عالمين أن مهما عمل كل واحد من

الخـــير فـــذلك ينالـــه مـــن الـــرب عبـــدا كـــان أو حـــرا).

بازرگانی کۆیلە Slave-trade بازرگانێکی گەرم بوو لە ئەوروپا بە دەگمەن دەوڵەتێکی لێی ڕزگاربووە.

برای سیکیولەر زۆر شانازی بە ئەوروپا و ئەمریکا دەکات ، بۆیە لە ئەوروپا و ئەمریکا دەست پێدەکەین .

ئیمپراتۆریەتی لاتینی –ڕۆمانی چەتری کۆکەرەوەی زۆربەی ئەوروپیەکان بوو، بۆیە هەر هێندە لە مێژووی دەرکەوتنی کۆیلایەتی دوور دەکەوینەوە . کۆیلایەتی لە ئەوروپا بە چوار قۆناغ تێپەڕیوە :

١. قۆناغی کەسابەت-بازرگانی
٢. قۆناغی پێویستی کار
٣. قۆناغی ڕەگەزپەرستی و ئایینی
٤. قۆناغی سێکسی

لە قۆناغی کەسابەتدا ئاماژە بە سەدەی پازدە دەکەین بە تایبەتی ساڵی ١٤٤٤. لەو ساڵە دەردەکەوێ کە بازرگانیکردن بە مرۆڤی ئەفریکی لە لوتکە بووە ، " بۆ نموونە لە ساڵی ١٤٤٤ دوە پورتوگالیەکان ساڵانە ٧٠٠تا ٨٠٠ کۆیلەی ئەفریکیان لە خوێش و کەسوکار دەدزی بەرەو ئەمریکا و ئەوروپا دەنارد." قەشە دی لاس کازاس وێنەیەکی تۆقێنەری سەدەی شازدە لە کتێبی مەسیحییەت و شمشێر دەگوازێتەوە کە ئەسپانیەکان چەند دڕندە بوونە بەرانبەر هیندیە سورەکانی ئەمریکا " هەر کاتێك هیندیەکان گوێبیستی هاتنی ئەسپانیەکان بوونایە ، بە دیاری دەچوونە پێشوازیانەوە ،

بەلأم ئەسپانیە مەسیحییەکان دیاریەکانیان لێوەردەگرتن و دەیانکووشتن یا بەرەو کەشتیەکە بانگیان دەکردن تا بیانبەن بە کۆیلە بیانفرۆشن –ل١٥ ." هەر لەو سەدەیەدا ئەسپانیەکان وێنەی ئاوایان تۆمار کرد جیهانی مەسیحی شەرم لە خۆی بکات بە جۆرێك دەیان ملیۆن کەسی بێ تاوانیان لە ماوەی ٥٠ ساڵ لە نێو برد یا کردە کۆیلە –ل١٢ سەرچاوەی پێشوو. نووسەری ئەو کتێبەی سەرەوە نەك هەر مەسیحییە بەڵکو مەتران بووە ، وەرگێڕی ئەو کتێبە دەڵێت : گەر کۆلۆمبس بە گەشتەکەی ئاشنای کردین بە ئەمریکای وڵاتی هیندیەکان ، وڵاتی مرۆی پڕ بەرائەت ، ئەوا لاس کازاس بە کتێبەکەی ئاشنای کردین بە قەسابخانەیەکی تۆقێنەر کە ئەسپانیەکان بکەرەکەی بوون : پیاوانیان کوشتن یا کردە کۆیلە بازرگانیان پێ کردن ، ژنەکانیان بۆ ڕابواردنی خۆ هێشتەوە!!

دوای ئەسپانیەکان ، پورتوگال و فەرەنسا و هۆلەندا و دانیمارك خەریکی ئەو بازرگانیە نامرۆییە بوون.

دوای سەدەی ڕێنیسانسیش پێویستی کۆیلەبوون بە ئاقارێکی تر داچوو ، کێڵگەی کشتوکاڵی ئەمریکی بووە هۆی کڕینی ژمارەیەکی زۆری کۆیلە...ڕەوشی کەسابەت و بازرگانی و پێویستبوون هەر بەردەوام بوو هەتا شۆرشی ئەمریکی ، کە لە مانفیستی ئەو شۆرشەدا هەندێ ماف سادەی کۆیلە دابینکرا . لە سەدەی هەژدەدا دانیمارك و بەریتانیا و ئەمریکا وازیان لە بازرگانی کۆیلە هێنا . لێرەدا کاریگەری شۆرشی فەرەنسی و شۆرشی پیشەسازی بەریتانیا لە بیر نەکەین ، کە پێشتر فیودالی ئەورووپی و ئەمریکی بە بیانووی پێویستی کێڵگەی کشتوکاڵی خەریکی بازرگانیکردن بوون بە مرۆی ئەفریکی و هیندی...لە یەکێ لە فلیمەکانی ئەمریکی بابای ئەمریکی زۆر ئازادانە کچی کۆیلەی ئەفریکی هەڵدەبژێرێت بۆ سێکسکردن

، لە ئاکام ژنی خۆی لە سێکسکردن بێبەری دەکات ، ئەویش ناچار دەبێت سێکس لەگەڵ کۆیلەیەکی ڕەش پێست بکات ، کە ژنە ئەمریکیەکە منداڵێکی ڕەش پێستی دەبێت ، پیاوە ئەمریکیەکە لە تورەیا توندترین ئازاری کۆیلەکە دەدات!!

سەدەی نۆزدە لە ئەوروپا و ئاسیا سەدەی بەرەو سەرمایەداری بوو . مرۆ لە وەهمی ئیمپراتۆریەتی کێشوەریی ڕزگاری بوو ، پێکۆڵی دەکرد دەوڵەت لە سەر بنیاتی نەتەوە دروست بکات . ئەو ئاراستەیە وەیکرد دەوڵەتە ئەوروپیەکان پەیمانی فینا-١٨١٤ لە بارەی قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە کۆیلە ببەستن . دەستوری ئەمریکاش لە ١٨٦٥ەوە بازرگانیکردن بە کۆیلەی قەدەغە کرد .

ئەو بازرگانیکردنە بە کۆیلە هەر مابوو هەتا کۆمەڵەی گەلان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە ١٩١٤-١٩١٨ ئەو بازرگانیکردن و کۆیلایەتی لە ئەوروپا هەڵوەشاندەوە.

ئایا ئەو شەش سەدەیەی کۆیلایەتی ئەوروپای مەسیحی سوکایەتی بە مرۆڤبوونی مرۆڤ نەبوو؟؟

واتایەکی دی لە چەمکی بەندەیی لە کوردیدا هەیە ئەویش خۆبچووککردنەوە و خۆ سفرکردن و جۆرێك لە ڕێزگرتنە لە ئاغا و دەرەبەگ و شێخ بە تایبەتی لە دەستەواژەی : " ئەز خولام -من خولامی تۆم " و " ئەز بەنی-من بەندەی تۆم " .

## کۆیلایەتی لە هەردوو دینی زەردەشتی و ئیسلام

بە حوکمی ئەوەی زۆربەی کوردی ئەقلیمی جیبال زەردەشتی بوون ، ئەوە دەهێنی ئاماژەیەك بە ئافرەت لە زەردەشتی و کەلتووری ئیران بکەین.

زەردەشتی دینێکی نێرسالاری بوو .ویل دورانت لەوبارەیەوە لە ل٦٠٨ی چاپی کوردی مێژووی شارستانیەت لە ئاڤێستا دەگوازێتەوە : " پیاوێك کە ژنی هەیە خاوەنی فەزیلەتە و پیاوێك کە کوڕی زۆری هەیەفەزیلەتی هەیە دەوڵەمەندتر و بالآتر لە پیاوێکە کە نیەتی ." هەر لە پێش ئەو دەقەوە ویل دورانت لە هەمان لاپەڕە دا دەڵێت : " فرەژنی و هەڵبژاردنی کەنیز و کەسانێك کە تەنها بۆ کاری سێکسی بەکار دەهاتن ، زەردەشتیەت بە کاری ڕەوا دەزانێت .

کەنیزەك و جاریە لە وڵاتی ئیران و ئەقلیمی جیبالی بندەستی ساسانی زۆر مشە بوو .

ئافرەت لە زەردەشتی نەفرەت بوو ، نەك نیعمەت وەك لە ئاڤێستا هاتووە باوك لە خوا داوا ناکات کچێکی بداتێ ، کچ بە نیعمەتێك نازانێت کە خوا بە مرۆڤی بەخشیوە-دیورانت ٦١٠ . لە ل٦٠٥ و ٦٠٦باس لە توراسی زەردەشتی دەکات لەوانە پارسیەکان و فارسیەکان دەکات کە بە قسەی پلوتارك مێژووی پارسەکان بە تایبەتی ئەردەشێری دووەم مێژوویێکی خوێناوی و بێڕەحمانە بووە ، سەبارەت بە شوێنکەوتووەکانیانی دوژمنیان دەڵێت : " وەك کۆیلە دەفرۆشت و شارەکانیان تالآن دەکرد و کوڕەکانیان لە پیاوەتی دەخست و کچەکانیان دیل دەکرد و دەیانفرۆشت ." ئەو

خەساندن و کۆیلەکردن و کەنیزەککردنە تەواوی حوکمڕانی زەردەشتی ٥٤٩ پ .م -٦٥١ میلادی داگرت بوو ، بۆ نموونە کریستنسین لە ٥٧٣ی ئیرانی سەردەمی ساسانییەکان دەنووسێت : " خەسرەو ئەبرویز ناسراو بە خەسرەو پەرویز کوڕی هورمزد لە حەرەمخانەی ( حەرەمسەرا ) خۆی دا ٣٠٠٠ ژنی بووە ، بێجگەی لەو کچانەی کە کارەکەر یان گۆرانیبێژ و بەزم گێڕ بوون ... ." شیرینی مەسیحی دوژمنی زەردەشتی یەکێك لەو ژنانە بووە ، کە دایکی بوراندۆخت و ئازەردۆخت بووە.

بینیمان زەردەشتیەت بە دەق ( ئاڤێستا ) و توراسی حوکمڕانی زەردەشتی تەواو پیاوسالاری بووە ، ماف زیاتر بە هاوسەری پاتیخساهی داوە نەك تەواوی ڕەگەزی مێ.[1]

لە مێژووی حوکمڕانی میدی ٧٢٩-٥٤٩ ی پێش زاین هەتا کۆتایی ساسانی لە ٦٥١ ی زاینی تەنیا دوو خوشك بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ بەشداربوونە لە حوکمڕانی دەفەرەکە ، لەو هەموو ساڵەش زەردەشتی ئاینی ڕەسمی دەوڵەت بووە .

---

١لە نێو کورددا لە قۆناغی فیودالی کوردیدا هەتا پاشایەتی لە عیراقدا ، دیاردەیەك هەبوو جۆرێك لە چەوساندنەوەی ڕەگەزیی ( نێر و مێ ) و چینایەتی دەگەیاند .ماڵی هەژار کچە بچووکەکانی خۆیان بە ماڵی ئاغا و کێخوا و شێخ دەفرۆشت ، چونکە ئەوانە مولکدار و زەویدار و ساماندارى کۆمەڵگای کوردەواری بوون . ئەوانیش لە کوڕەکانی خۆیان مارەیان دەکردن . ئەو کچانە لە قەصر و کێڵگەکان کاریان پێدەکرا ، کە گەورە دەبوون ئەو دەردبەگانە بە ئەختێکی زۆر دەیاندا بە ماڵی تر . ئەو کچانە ناسرا بوون بە کارەکەری ماڵی ئاغا ، شێخ ، پرۆسەکەش ناسرابوو بە سۆرانە لە دەشتی هەولێر .

له پاش زەردەشتیەتی ئەقلیم جیبال و مەسیحیەتی جەزیرە ، کورد دووەم نەتەوەیە وەك نەتەوە ئاشنابووە بە ئیسلام . جگە لە مەسەلەی عەقیدەیی ، نووسەری دژەئیسلام دژ بە پرانسیپەکانی ئیسلام و دیاردەی جڤاکی وەك مولکی یەمینی ناو هەناوی ئیسلام وەك دەقی ئیلاهی و داب و نەریتی ( توراسی ) موسڵمان قسەیان کردووە .

بەرێز سامی کازم لە وتارێکدا بە ناوی (الرق في تاريخ الاسلام والعلمانية) .

لەوە دەست پێدەکات کە سیکیولەری وەك جابری و ئەبوزێد و سید قمنی لە بارەی هەبوونی دەقی موللکی یەمین و کۆیلە هێرش دەکەنە سەر ئیسلام . مولکی یەمین دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە هەتا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆش لە ئەوروپا و ئەمریکا و کەنداو و کوردستان هەیە ( لە بەشی دادێ بە درێژی لەم پرسە دەدوێین ) .

لە لایەکی دی وەك بینیمان کۆیلایەتی بەرهەمی ئیسلام نییە ، ئیسلام هات وا ڕێکیخست کە بە کۆیلایەتی نەچێت ، چونکە ئامانجی ئیسلام ئیلاهیە بۆیە وەك سامی کازم دەڵێت ئامانجی ڕزگاری مرۆڤە ، نەك بەرژەوەندی ." کاتێ لە دامەزرێنەری ئەمریکا دەپرسن بۆچی کۆیلایەتیت لە ئەمریکا هەڵوەشاندەوە ، بە کورتی دەڵێت لە پێناو یەکێتی ئەمریکا نەك کۆیلایەتی ! ئیسلام ئاوها بیر ناکاتەوە بەڵکو چەقی پرسەکانی بریتیە لە مرۆڤ ، بۆیە بۆ بنبڕکردنی کۆیلایەتی چەندەها ماف بۆ دانا هەتا تەواو کوشتنیشی حەرام کرد . لە لایەکی دی ئیسلام کەفارەتی چەندەها تاوانی بە ئازادکردنی بەندە بەستەوە ، لەوانە

١. کوشتنی بێ مەبەستی موسڵمان وەك ئەوەی پێی دەڵێن لەدەست دەرچوون ،

٢. شکاندنی ڕۆژووی ڕەمەزان بەبێ هۆ –جووتبوون لەگەڵ ژنی خۆت لە ڕۆژی ڕەمەزان ،

٣. بە ژن بڵێی تۆ وەك دایکمی –ئیزهار

... هتد

ئەو هەموو مافە قورئانی و سوونەتیە وەیکرد لە ماوەیەکی کورت دیاردەی کۆیلایەتی لە کۆمەڵگای ئیسلامی نەمێنێت ، کەچی ئەوروپا و ئەمریکا بە زیاتر لە ٥٠٠ ساڵ توانیان بنبڕی بکەن!
لە هەمووش گرینگتر کۆیلایەتی ئەوروپا و کۆیلایەتی ناو قورئان تەواو لە یەك جودان .

لێرەدا ئەوە دێنێ قسە لە سەر " بەندەی خودا " و " بەندەی مرۆڤ " بکەین . بەندەی خودا لە ڕووی مەعریفیەوە یان ئەوە ناسراوە بە ما فوق المعریفە البشریە لە پێغەمبەری ئولو عەزمی وەك موسا زیاتر و گەورەترە . لە سوڕەتی کەهف دەردەکەوێ ئەوەی لە کەلتووری کوردی ناسراوە بە خدری زیندە مەعریفەی ئەودیوی شتەکانی پێدراوە ، بۆیە شتی نامۆ بە مەعریفەی موسا دەکات .

لە لایەکی دی بەندەی مرۆڤ هەتا لای هەندێ موسلمانیش تێگەیشتنێکی چینایەتی لە خۆ دەگرێت ، وەك لە پرسی زەید و زەینەب دەرکەوت . زەیدی خاوەن پاشخانی کۆیلەیی ، هاوسەرگیری زەید و زەینەبی کردبووە دۆزەخ هەتا لە یەك جیابوونەوە .

## سەرباسی دووەم: بۆ کۆیلە و کەنیزەک لە کۆمەڵگا هەیە؟

دووربوون لە پەیامی خودا وای لە دەسەڵاتدارەکان و بازرگانەکان کرد بیر لە بازرگانیکردن بە مرۆڤ بکەن. دیاردەی هەبوونی کۆیلە و کەنیزەك (کارەکەر) هەر لە سەردەمی فیرعەونەکان هەبووە . قورئان لە چەندەها ئایەت پێماندەڵێت : فیرعەونەکان بە تایبەتی رامسیسی دووەم ، فیرعەونی سەردەمی موسا پێغەمبەر ، لە پێناو شرۆڤەی خەونێك نێری بەنی ئیسرائیلی ساڵێك نا ساڵێك دەکوشت ، ئافرەتەکانیشی بۆ کارەکەری دەهێشتەوە " هەروەها لە سەردەمی بابلی و ئاشووری و دادگای لێکۆڵینەوە جوولەکە چەندان جار کراونەتە کۆیلە.

بێزەنیەکان –ڕۆمەکان نزیکترین ئومەن لە عەرەبەکان ، دەبێ ئەوان چۆنیان لە ئافرەت ڕوانی بێت ، دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی لە ل ٢٨ ی کتێبی ژن لە ئیسلام دەگوازێتەوە کەپرسەکە لای باپیری ئەوروپیەکانی ئەمرۆ جیاواز تر نەبووە لە عەرەبی جاهیلی و فارسی ساسانی وەك دەنووسێت : " لە لای ڕۆمانیەکان و یاساکانیان ئافرەت هیچ مافێکی پێنەدرابوو بگرە گشت ئەو مافانەی کە هەیان بوو لێیان بردرابوو، پێش ئەوەی کە شوو بکات مولکی گەورەی خێزانەکەی بوو، گەورەی خێزانەکەی ئەگەر بیویستایە دەیتوانی بیکوژێت ، یان بیفرۆشێ ، وە پاش شووکردنیشی پیاوەکەی لە شوێنی باوکی کچەکە دەیتوانی بە هەمان شێوەی باوکی ڕەفتار لەگەڵ ژنەکەی بکات، چونکە ئافرەت لای ئەمان ئازاد نەبوو و ماف

ئازادیشی نەبوو..." هەر لەو کتێبەی سەرەوە ڕای نیتچە و فەیلەسوفێکی وەك ئەفلاتۆن –پلەیتۆ دەربارەی ئافرەت دەهێنێتەوە ، مرۆ شەرم دەکات لە ڕایەکانیان ، بۆیە دەنووسێت : " وە نەبێت ڕەوشی ئافرەت لە شارستانیەتی فەیلەسوفانی یونانی بە تایبەتی ئەفلاتۆن و ئەرستۆ تالیس باشتر بێت لەوەی ڕۆمانیەکان، هەر بە هەمان شێوەی ڕۆمانیەکان لەگەڵ ئافرەتدا ڕەفتاریان دەکرد، بە چاوی بەندەو کۆیلە سەیریان دەکرد..."

لە سیرە دەردەکەوێ زۆربەی موسلمانە بەرایەکان کۆیلە بوون لەوانە بیلال ، زەید ، عامر ، سلێمان فارسی هەروەها دیاردەی کەنیزەك و سۆزانی زۆربەی ژیانی عەرەبی جاهیلی داپۆشی بوو.

ئەوانەی دەڵێن ژنی عەرەب ئازاد و خاوەنی مەنزڵی خۆی بووە ، بۆ ڕاستی ئەرگومێنتەکەش چەند دەقێکی شیعری موعەلەقات دەکەنە پاڵپشت . موحەمەد عبدالەقسوود ٢٠١١ لە ل٦٦-٦٧ ی ژن لە ئایین و چاخە جیاوازەکاندا یەك لەوانە دەقێکی ئیمروء ولقەیس دەهێنێتەوە

أفاطم مهلا بعض هذا التدلل

و ان كنت قد ازمعت هجري فأجملي

اغرك مني ان حبك قاتلي

و انك مهما تامري القلب يفعل

واتە بەسە ، ئەم ناز و نووزە کەم کەوە . من بەرگەی ئەم نازەی تۆ ناگرم ... هەتا تۆ هەر فەرمانێك بدەی دڵ ئەنجامی دەدات ."، بەڵام لە

ڕاستیدا قورئان پێچەوانەکەی دەگێڕێتەوە ، ئەو ژنانەی دەسەلات و مەنزڵی کۆمەلایەتی خۆیان هەبووە ژنی ئازادی سەر بە چینی سەرەوە بوون .

ئەمە و بوونی کەسانی وەك هیندی خێزانی سوفیان لە سیاسەت و خەدیجە لە بازرگانیدا ، ئەوەمان پێدەڵێن کە تەنیا ژنی خانەدان و ماڵبات ،کە بە ژنی ئازاد ناسراو بوون وەك وەك ژنی پاتیخساهی ناو کۆشکی ساسانی خاوەن ئەو مەنزڵ و پیاهەڵدانە بوون ، ئەوانی تر یا ئافرەتی هاکەزایی بوون یان کەنیزەکی ماڵان و سۆزانی ناو خانووی دەعارەت بوون.

لە لایەکی دی دیب علی ۲۰۰۷ لە ل۱۸ ی کتێبی المرأت الیهودیە باس لە هەندێ ناوی ناسراوی ناو کۆمەڵگای عەرەبی دەکات کە بە ناوی دایکەکانیان ناسراون لەوانە " منذر بن ماء السماء ، عمرو بن هند ، شرحبیل بن حسنة ، معاذ بن عفراء "

ئەو دیاردەیە بەرزڕاگرتنی ئافرەت نییە ، بەڵکو دیاردەیەکی کۆمەلایەتیە ، کە منداڵی پاش مردنی باوك ئەو شوناسە هەڵدەگرێت ، ئەو دیاردە کۆمەلایەتیە لە نێو کۆمەڵگای لادێنشینی کوردیش هەیە وەك قادری سێوێ ، عەزیز ستێرێ ...

ئیسلام کە هات ڕووبەڕووی ئەو دیفاکتۆیە کۆمەلایەتیەی کۆیلە و جاریە و سۆزانیەت بۆوە .

کۆیلەبوون و خانەدانبوون لە زۆربەی کایەکانی ژیان کاری لە سەر دەکرا ، زەینەب کە لە ماڵباتێکی دیار بوو ، درابوو بە زەیدی پێشتر کۆیلە ، بۆیە ئەو روحە چینایەتیە لە هاوسەرگیریەکە هەبوو ، زەینەب پرسەکەی

دەروژانـد و زەیـد داوای جیابوونـەوەی دەکـرد ، پێغەمبـەریش دەرکـی بـەو جیاوازیە ماڵباتیە دەکرد ، بـەلأم شـەرمی دەکـرد ، خـودای کاربـەجێ بڕیـاری ئەو جیابوونەوەی لە بەر دوو هۆ دەرکرد :

أ. ئەو دوو چینە پێکەوە هەڵناکەن ،

ب. کوڕی تەبـەنیکراو نابێتـە کوڕی خـوێن لـە شـەرعدا ، بـەڵکو بـاوکی منداڵ ئەو باوکەیە کە منداڵەکەی لێ وەپاش کەوتبێت .

بۆیـە لـە یـەك جیابوونـەوە . ئـەو جـۆرە هاوسـەرگیریە (هاوسـەرگیری دوو چـینی جیـاواز ) بەرهـەمی بیرکردنـەوەی جاهیلیەت بوو ، ئیسلام بەرییە لێی .

لە گوتـاری قورئانـدا خۆیـا دەبـێ مرۆڤـەکان هـەموو لـە مرۆڤایـەتی ، دادوەری ، یەکسانی ، ڕێزی ئیلاهی یەکسانن.

## سێیەم، بنەماکانی یەکسانبوون لە قورئاندا

چوار بنەمای گرینگ هەن ، هەموو مرۆڤەکان دوور لە ئایدیۆلۆژیای دینی و سیاسیەوە یەکسانن . دکتۆر مستەفا زەلمی لە لاپەڕە ٣٦-٤٢ ی کتێبی وشککردنی زەلکاوی .... باسی لە بنەماکانی یەکسانی لە قورئان کردووە .

### بنەمای یەکەم
### یەک کانزایی –یەک سەرچاوەیی

خۆڵ و سپێرم دوو پێکهاتەی هەموو مرۆڤەکانن . خۆڵ کانزای بەرایی دروستبوونی مرۆڤ و کۆتاییەتی ، بە واتای مرۆڤ لە خۆڵ دروست کراوە و بۆ خۆڵ دەگەڕێتەوە . پاش دروستبوونی حەوا ، تاکەکانی کۆمەڵگا لە نێر و مێیەک دروست بوون . هەموو مرۆڤ بە نێر و مێ و نێرەمووک لەو دوو پێکهاتەن :

١. خۆڵ

لە سەرەتای خەڵقی ئادەم و دەرکەوتنی ، جۆرە ململانێیەک لە نێوان سەرۆکی جنۆکەکان بە ناوی ئەهریمەن ( شەیتان ) و فریشتە دەربارەی ئەو پرۆسەیە دروست بوو . فریشتە لە ڕۆناکی خەڵق بووە هەروەها وا پرۆگرامکراوە لای زاتی خودا کە پێشگیری لە کاری خودا نەکەن . پرسکردن لە بوونی ئەو بوونەوەرە بۆ دەرخستنی گوێڕایەڵی خۆیان بوو ، بەلاَم هەرکە بۆیان دەرکەوت کە ئەو بوونەوەرە لە خۆڵ دروستکراوە گوێڕایەڵی خودا بکات لە فریشتە زیرەکترە.

فەرموودەی ئێوە هەموو لە باوکە ئادەمن ، باوکە ئادەمیش لە توراب،" لوتکەی یەکسانی مرۆڤەکانە لای خودا . لە ل٢٣٨ ی فەرهەنگی ئەلمونجیدی کوردی دەربارەی توراب هاتووە : " گڵ ، خۆڵ ، خاك ، زەوی نەرم ." توراب هەموو مانایە ژێر پێی مرۆڤ دەگەیەنێت، کەواتە ڕەگەزپەسندی لای مرۆڤ نییە ، بەڵکو ئەوە شەیتان و شەیتان ئاساکانن ئەو ڕەگەزپەسەندیە دەوروژێنن ، بۆیە ئەوە ئەهریمەن بوو نەك فریشتە بە دەسەلاتی ئادەم ڕازی نەبوو .

وەك گوتمان لە پرۆسەی خەلیفەبوونی ئادەم لە سەر زەوی ئەوە ئەهریمەن بوو، کە لە ئاگر دروستکرابوو ، بە دەسەلاتی ئادەم ڕازی نەبوو و سوزدەی ڕێزی بۆ ئادەم نەبرد .لێرەوە شۆفینیزم ( ڕەگەزپەسندی ) لای ئەهریمەن دروست بوو!

گریمان ئەهریمەنی نەفرەت لێکراو حەقی بە خۆی دا کە دوژمنداری ئادەم و نەوەی بکات چونکە ڕەگەزی جودایە ؟ ئەدی مرۆڤەکان بە شا و گەدا ، فیرعەون ( خوداوەندی درۆینە ) و ڕەعیەت لە هەمان ڕەگەزن ، بۆ هەندێ خۆیان بە سەر هەندێکی تر پەسەند دەکەن؟ ئەرێ نازانن ئەو خود پەسەندیە ڕەگێکی لە شەیتان دۆستیە؟!

کە ئاغا و کۆیلە خاوەن یەك سەرچاوە بن ، ئەو هەموو لەقەبکارییەی بۆچییە؟ خەڵقی ئادەم و عیسا لە ڕواڵەتدا لە یەك جیاوازن ؟ بەلاَم خودا لە ئایەتی ٦٠ی ئال عیمران جەخت لەوە دەکاتەوە کە خەڵقی عیساش وەك ئادەم وایە ، ئێوە هەموو مرۆڤەکان لە خۆڵ دروستکراون.

ئەصلی تەفزیلی پێغەمبەرەکان لە سەر یەکتر ، پیاو لە سەر ژن ... پەیوەستە بە تەقواو ڕەوشەوە وەك لە سورەتی حوجرات دەفەرموێت :" بەڕێزترینتان لای خودا بە تەقوا ترتانە"

ئازادبوون و کۆیلەکردن دوو دیاردەی مرۆڤکردەن نەك خودایی . قسەکەی عومەری کوڕی خەتاب کە دەڵێت : تاکەی مرۆکان دەکەن بە کۆیلە لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایك بوون ." تەواو ڕاڤەی گوتاری خودا دەکات .

کورد لە هەموو نەتەوەیەك زیاتر دەرك بە سەرچاوەی خۆڵبوونی مرۆڤ و نەژادپەرستی نەتەوەی دەوروبەر دەکات.

پرسی ئێسك و پروسی منداڵ و ...لە پرۆسەی هۆلۆکۆستی – قڕکردنی کورد لای بەعس و هەڵدانەوەی گۆڕە بە کۆمەڵەکان باشترین بەڵگەی کۆنکریتیە ،کە مرۆڤ لە خۆڵ دروستکراوە هەروەها حاڵەتی داگیرکردنی کوردستان لە لای نەتەوەی موسڵمانی دی لوتکەی نەژاد پەسندی ئەهریمەنیە...ئایا تورك و عەرەب و فارس قبووڵی ئەوە دەکەن کە لە ئەهریمەن ئەهریمەنتر بن ! چۆن؟ ئایا ئەوانیش وەك کورد لە خۆڵ دروست نەکراون؟؟؟

## ٢. سپێرم

وەك گوتمان لە بەرایی خەڵق هەموو لە ئادەم وەپاش کەوتووین ، ئەویش لە خۆڵە . لە پرۆسەی کۆنکریتیش هەموو لە زاوزێی مێیەك و نێرەك بە هۆی سپێرمەوە دروست بووین . خودا لە چەندان ئایەت ئامازەی بەو سپێرمە کردووە . ئەوەتە لە ئایەتی ٥-٨ی سورەتی الگارق ئاوا لە پرۆسەی خەڵقی نێر و مێ لە سپێرمی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەت

دەدوێت : " مرۆڤ با تەماشاکا لە چی دروست بووە؟ لە ئاوێکی هەڵقولاو-بەفیچقە دروست بووە .ئەو ئاوە مەنی پیاوە هەرکاتێ لە هێلکۆکەی گیربوو، بە ویستی خودا مەنی و هێلکۆکەکە هەڵدەقولێن بۆ ئافەراندنی مرۆڤ ، ئەو ئاوە هەڵقولاوە لە نێوان بڕبڕەکانی پشت و ئێسکەکانی سینە دەردەچێت . هەر خودا توانای جارێکی تر دروستکردنەوەی مرۆڤی لا ئاسانە ."

کەواتە پاشا ، فیرعەون ، نەمرود لەگەڵ تەواوی ڕەعیەت لەو دوو کانزایە دروست بوونە . لە خەڵقدا تۆزقاڵێك نایەکسانی نییە ، چۆن لە مردندا نایەکسانی نییە .

هەموو مرۆڤەکان بە موسڵمان و غەیرە موسڵمان خاوەن یەك بنەمان لە خۆڵ و سپێرم وەپاش کەوتوون ، ئەو دوو کانزایەش زۆر بێ بەهان!

لە سورەتی کەهف دا ئەوە دووپاتکراوەتەوە کە خۆڵ و سپێرم سەرچاوەی هەموو مرۆڤێکن ، بۆیە ئەوە ناهێنێ هیچ مرۆڤ لە خوا عاصێ بێ و لاڤ زلزانی و دەعیە لێبدات .

## بنەمای دووەم
## یەك ڕێز

ئـەو مرۆڤـەی لـە خـۆڵ و سـپێرم دروسـت بـووە ، لـە ڕەفتـاردا زۆری وەیلێـدێت لـە بـڕیتی بـاوەڕ ، ئایـدیۆلۆژیا ئاراسـتەی دەكـات .ئـەو ئایدیۆلۆژیایەش چ چەپی ، قەومی ، ڕەگەزپەسندی....بێت تەواو دوورە لـە بەرنامـەی خـودا . پـاش ئـەو بـێ ڕێزیـەی مرۆڤـی نـاو ئایـدیۆلۆژیا بـە زاتـی خودا ، خودا هەر ڕێزی لێگرتووە .

ئەوەتە خودا لە ئایـەتی ٧٠ی سورەتی الاسـراء دا تـەواو ڕێـز لـە مـرۆڤ دەگرێت :" ولقـد كرمنـا بـنی أدم... ڕێزمـان لـە بـەنی ئـادەم گرتـووە ." ئـەو ڕێزە بۆ هەموو مرۆڤەكانە نەك تەنیا توێژێك و چینێك ...بـە واتایـەكی دی مرۆڤەكان هەموو بەنی ئادەمن .ئەفسووس ئـەوە مرۆڤـەكانن ڕێـزی یـەكتر و زاتـی خـودا نـاگرن و سـتەم دەكـەن بۆیـە لـە بەرانبـەر ئـەو سـتەمە خـودا مرۆڤەكان ئازار دەدا،تا سیستەمێكی ستەمكاری لە كۆمەڵگا دروست نەكەن.

## بنەمای سێیەم
## یەك چارەنووس

هەموو مـرۆڤەكان بـە شـا و گـەدا یـەك چارەنووسـیان هەیـە و " دەبـێ هەموو تامی مەرگ بكەن ..." هەروەها بە زاتـی پێغەمبـەریش دەفـەرمووێت : " تـۆ دەمـری و ئـەوانیش دەمـرن ..." كەواتـە مـردن پەیوەسـت نییـە بـە توێـژێك یـا چـینێك ، بـەڵكو پێغەمبـەر و ئـەبو جـەهل...دەبـێ تـامی مـەرگ بچێژن . ئەفسانەی گلگامێش تەنیا لە زاكیرە و خـەیاڵی مرۆڤـدا گینگڵ دەدا بەبێ هەبوونی ئاكامێك .

پرۆسـەی مـەرگی دەسـەڵاتدار لـە كۆشـك و گـەدا لـە تەوێڵـە هـەموو پۆستەكان هەڵدەوەشێنێتەوە . كەواتە هەموو یەكسانین لە مەرگ .

## بنەمای چوارەم
## یەك بەرپرسیاریی

بەرپرسیاریی بنەڕەتی مرۆڤ ئاوەدانکردنەوەی زەویە . کۆمەڵگای بەختیار و خۆشگوزەران بە هەرەوەزی بەرپادەبێت . هەموو مرۆڤەکان لە بیناکردنی ئەو کۆمەڵگایە بەرپرسن ، بۆ نموونە لە قوتابخانە مودیر و مامۆستا و قوتابی و بەردەست و پاسەوان و فەراش هەموو پێکەوە بەندن :

- مودیر نەبێ ، فەوزا و نایەکسانی دەبێ

- مامۆستا نەبێ ، مودیر بەهای چیە؟

قوتابی نەبێ ، مامۆستا بۆچیە؟

بەردەست و پاسەوان و فەراش نەبن ، قوتابخانە دەبێتە زبڵدان ، ئەمنی مەکتەب بە هیچ جۆرێك پارێزراو نابێت!

هەموو مرۆڤەکان بەشدارن لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی . هەموو نابینە دکتۆر ، ئەندازیار ، مامۆستا ،....گەر وەستا نەبێ کێ دیوار دروست بکات؟ لە وڵاتدا یەك شا هەیە ، نەك سەد شا ! گرینگ ئەوەیە عەدالەت سەقامگیر بێت تا دەوڵەتێکی موئەسەساتی دروست بکەین بۆ ئەوەی هەموو هەست بە ئینسانی خۆمان بکەین.

لەو چوار بنەمایەدا شا و کۆیلە وەك یەك یەکسانن...با شایەك وەك فیرعەون و نەمرود بڵێت من نامرم ، من خودام...ئاکام چی دەبی ؟ وەك فیرعەون بە مردنێك دەمری ، دەبێتە پەند.

## کەنیزەك یا مولکی یەمین

کە ئیسلام هات کەنیزەك لە کۆمەڵگا هەبوو چ لەکۆمەڵگای عەرەبی بێساسانی ( فارس، کورد، پارس )یا ڕۆمانی. کەنیزەك لای ئیسلام جاریە نییە، بەڵکو ئەو ئافرەتانەن کە لە ناچاری و دەستکورتی لە ماڵان کارەکەرن . هەموو فەرهەنگە کوردی و فارسیەکان لە سەر ئەو پێناسەیە کۆکن .

ئەو ئافرەتانە لە کۆمەڵگای نا –ئیسلامی سێکسیان لەگەڵ دەکرێت ، بۆ نموونە تەوراتی جوو دەڵێت سلێمان ٣٠٠ کەنیزەکی هەبوو هەروەها لە مێژووی ساسانی هاتووە خەسرەوی دووەم باوکی دوو کچە فەرمانڕەواکەی ساسانی ٦٢٩-٦٣٢ ی میلادی ژمارەیەکی زۆری کەنیزەك هەبوو ، شیرینی مەسیحی یەکێ بوو لەوانە !

لە فەرموودەیەکی بوخاری و موسلم هاتووە : ئەوەی کچی کەنیزەك مارە بکات دوو خێری پێدەکات : ئازادبوون و مارەبڕین . ئەو فەرموودەیە لە ل٩٦ ی کتێبەکەی عەبدولەقسوود تۆمارکراوە : " هەر یەك لە ئێوە کەنیزەیەکی لە ژێر دەستدا بوو ، با باشترین شێوە فێری ئەدەبی و خانەدانی بکات هەروەها بە باشترین شێوە فێری خوێندەواری بکات ، لە پاشان ئازادی بکات و لە خۆی مارە بکات ، دوو پاداشت وەردەگرێت : پاداشتی ئازادکردن لە کەنیزەکی و پاداشتی مارەبڕین ."

ئایا لە سەردەمی ئێستادا پیاو بە واتای پیاوێتی هەیە ئافرەتێکی کارەکەر و چینی خوارەوە لەو تەبەقەیە ڕزگار بکا و تەواوی ڕێزی ژنی خانەدان و ئازادی بداتێ و بیکاتە دایکی مناڵەکانی ؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

ئـەمڕۆ لـەم عەصـری تەکنـەلۆژیا و مـافی مـرۆڤ و فێمینیستی کـام مەسـئولی ئەوروپی و ئەمریکی و (کوردی فێمینستی ڕواڵەتباز ) هەیـە قـەبوولی ئـەوە بکـات کـەنیزەکێك ببێتـە هاوسـەری؟ کامـە هەیـە قـەبوولی ئـەوە نـەکات هەردەم لە شەوە سورەکان دابیت؟؟ گەر وا نییـە کتـێبی دمریایـەك لـە تـاوان بخوێننەوە!!

میراتی ئیسلامی بەخشینەوەی سەروەت و سامانی مردووە. زۆر جار لە خۆم دەپرسم خودا چ پەکی بەوە کەوتیە میراتی مێ نیوە لە چاو نێر نیوە بدات ؟ قورئان دوا کتێبی ئاسمانییە بە واتای کۆتایی مێژووە بە نیسبەت خوداوە ، هیچ کتێبی کەلامی و پێغەمبەرێك بۆ مرۆڤەکان نانێرێت . کە وایە ، قورئان پێویستی خوێندنەوەیەکی ورد هەیە بۆ موسلمانەکان بە پلە یەك ، چونکە خودا دەربارەی بێباوەڕان یەکلابۆتەوە کە باوەڕ ناهێنن . لە ئایەتی ٦ -٧ی سورەتی بەقەرە خودا دەفەرموێت ئەوانەی باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی دوایی نییە ، بیانترسێنی یان نا ئیمان ناهێنن ، خودا بە غەزەبی خۆی مۆری ناوە بە سەر دڵ و بە سەر گوێچکەیاندا هەروەها بە سەرچاویان پەردەی عیناد و کەللەڕەقی هەیە-تەفسیری نامی ل٣. لەم ئایەتانەدا خویا دەبێت ، ئەوە دەستێکی ترە بە گوێرەی میزاژی خۆی تەفسیری دەقی قورئان دەکات.

با بزانین گوتاری قورئان لە سەر جیاوازی جێندەری دامەزراوە؟ فێمینیستەکان بە گشتی فێمینیستی کوردی هەردەم ئایەتی ( ١١ )ی سورەتی نیساء بە نموونە دەهێننەوە ، کە قورئان مێی بە نیوەی نێر حسێب کردووە . ئایەتەکە دەڵێت :" نێرینە دووئەوەندەی مێینەی هەیە " گەر ئەوەندەی ئایەتەکە وەرگرین ، لە ڕواڵەتدا بانگەشەی فێمینیستەکان دروست دەردەچێ ، بەڵام جگە لەوەی قورئان کتێبی پەیڕەوی ژیانە ، خودا هیچ پێویستی بەوە نییە ستەم لە مێینە بکات ، چونکە خودا ستەمی لە سەر خۆی حەرام کردووە . بە پێی ئابووری ئیسلام (ڕەوش) لە پێش (ماف ) دێت ، بۆ نموونە کوڕی خەلیفە و کوڕی هەژارێك هەردوو نێرن هەروەها دەسەڵاتی کوڕی خەلیفە لە ڕواڵەتدا زیاترە ، بەڵام چونکە ڕەوشی هەژارەکە شایەنترە بە زەکات ، ئەو بڕە پارەیە هەتا کوڕە هەژارەکە هەبێت نادرێت بە کوڕە خەلیفەکە !

لە دوای ئایەتەکە باسی ( دایك –مێ ) و ( باوك –نێر ) دێت ، قورئان ڕەوشەکە ئاوا وێنا دەکات " باوك و دایکی مردوو هەر یەکی ( شەشیەکی میرات ئەبەن ئەگەر مردووەکە منالی هەبوو نێر یا مێ ..." ئایا دایك و باوك مێ و نێر نیین ؟؟ ئایا ئایەتەکە نابێژیت : گەر منالی کچی – مێ یا منالی کور- نێر هەبوو وەك یەك دەبەن ؟؟لە ئایەتی ١٢ی نیسا هاتووە : ژنێك مرد ( خوشکێك –مێ ) یا ( برایەك-نێر )ی هەبوو شەش یەك وەردەگرن ، کە زیاتر بوو سێ یەك وەردەگرن...خوشك و برا ، مێ و نێر نیین؟!

لە لایەکی تر کە میرات لە ئیسلام لە سەر مێیەتی و نێریتی دانەمەزراوە ، بەڵکو لە سەر نزیکی و دووری میراتگر لە مردوو وەستاوە ، بۆ نموونە دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی ٢٠١٥ لە ل٨٠ دەنووسێت : " : پلەی نزیکی میراتگرەکان جا (نێر)بن یان (مێ) لەگەڵ مردووەکە و میراتی مردووەکە، هەرکاتێ میراتگرەکە لەمردووەکە نزیك بێت ئەوا پشکی زیاتر لەمیراتەکە دەبات بەپێچەوانەشەوە چەندی پەیوەندیەکە دوورتر بێت پشکی لەمیراتەکە کەمتر دەبێت، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەزی میراتگرەکان دەبینی کە کچ بەتەنها نیوەی میراتی دایکی دەبات کە (مێ)یە بەڵام باوکی – مێردی مردووەکە – چارەکی میراتەکە دەبات لە(کاتێکدا نێرە) ئەم جیاوازیەش لەبەرئەوەیە لەنێوان کچ و مێردی مردووەکە کچەکە نزیکترە لە مردووەکە، بۆیە بەشی کچەکە زیاتر دەبێت لەمێردی ژنەکە (باوکی کچەکە)." هەروەها لە هەمان کتێب لە ل٨١ دەنووسێت فەلسەفەی ئیسلام لە سەر جیاوازی نێوان ڕەگەزەکان دانەمەزراوە :" کچی مردووەکە زیاتر لە دایکی وەردەگرێت لەکاتێکدا هەردووکیان (مێ)یەن هەروەها کچی مردووەکە زیاتر لە باوکی دەبات کاتێ برایەکیشی هەبێت، هەتا ئەگەر کچەکە بچووکیش بێت (شیرە خۆرە) شێوەی باوکیشی نەناسێ، هەروەها

کوڕی گەورە زیاتر لەباوکی دەبات لەکاتێکدا هەردووکیان نێرن لەو پێوانە و پێوانەکانی تر فەلسەفەی میرات لەئیسلامدا چەندین حیکمەتی خودایی بەرز و چەندین مەبەستی جیاکەرەوە هەن کە لەلای زۆرێك شاراوەن! ئەویش ئەو پێوانەیە کە هیچ پەیوەندیەکی بەڕەگەزی (نێر) و (مێ)یەتیەوە نیە."

پاش ئەم ڕوونکردنەوە و سازگارکردنی فەلسەفەی میرات لە ئیسلام ، بۆت دەردەکەوێت ، کە فێمینیستی شەرق ئەوسەتی ، کوردیش وەك بەشێك لێی ، لە چ قەیرانێکی شوناسی دەژین ، ئەوان بانگاشەی کرانەوە و خوێندنەوە دەکەن ، بەلام لە ئاست ئەم ڕاستیە خۆیان کاس و کەڕ دەکەن ، چونکە خودی بزاڤەکە بزاڤێکی شرۆڤەکاریی –ژمارەیی نییە ، بەڵکو بزاڤێکە لە سەر ڕق –ڕك لە زاتی خودا ، لە قەدەری مێی ، بوونی پیاو لە کۆمەلگا دامەزراوە!

لەوانەیە بیانووێك بۆ ئەو ڕقە لە دوو ڕێگەوە بینینەوە :

١. جەهڵی فێمینیستی کوردی بە دەق و گوتاری قورئان.

٢. توراسی عەرەبی ئیسلامی و کەلتووری چینداری کوردی.

ئەو دوو بەهانەیە لە بەرانبەر فێمینستی ڕۆشنبیری شرۆڤەکار دا هەر زوو هەڵدەوەشێتەوە ، چونکە ئیسلام بە پلە یەك واتای تێکستی قورئان و فەرمووده دەگەیەنێت ، نەك توراس و کەلتوور . هەڵوێستی ئیسلام لە بارەی هەر شتێکەوە لەسەر دەق حسێبی بۆ دەکرێ ، نەك مێژوو و کەلتوور ، بۆیە بانگەشەی فێمینیستەکان لەمەڕ جیاوازی جێندەر لە قورئان بێ بنەمایە . بە هیچ جۆرێ تۆمەتی فێمینیستەکان خودان

ئارگومێنت نییە ، میرات لە سەر ڕەوش دامەزراوە نەك جێندەر ، دەقەكانی قورئانیش شاهیدن ، نەك میراتی ناو كەلتوور و مێژوو كە پیاوی عەرەب و فارس و كورد كاری لە سەر دەكەن !!!

بە كورتی ئێمە باسی میراتی ناو قورئان دەكەین ، نەك میراتی ناو توراس و كەلتووری كوردی . ڕاستە فیودالی كوردی هەتا هەشتاكانی سەدەی بیستەم ڕەگی بێوەریكردنی مێی لە میرات هەر لا مابوو ، ئەو ڕەگە پەیوەستە بە توراسی دینەكانی تر ، نەك قورئان ، بۆیە قۆستنەوەی ئەو پرسە لە لای فێمینیستی كوردی گەڕاندنەوەیە بۆ كەلتوور و توراس هەروەها خۆڵ لە چاو كردنی عەوامە.

ئەو تۆمەتە لە كوێ هات ؟؟

كوردی ئەقلیم جیبالی ژێر سایەی دەوڵەتی ساسانی زۆربە پابەندی دینی رەسمی دەوڵەت بوون ، ئەو دینەش زەردەشتی بوو ، هەرچی كوردی جەزیرە بوو ، كوردی ژێر سایەی مەسیحیەت بوو. لە بەشی ئەقلیم جیبالیش كوردی جوولەكە و مانی و مەزدەكی هەبوو.

بوونی ئەو هەموو دینە دژ بە یەكە تەنیا لە ئەقلیم جیبالی زەردەشتی ، بۆ نموونە زەردەشتی بۆ ماوەی چل ساڵ خەریكی چەوساندنەوەی مەسیحیەكان بوو هەروەها مانی و مەزدەكی لە دان و ستاندن تیرۆر كرد، ڕەگێكی كۆنی لە كۆمەڵگای كوردی چەقاند بوو ، تەنیا لە حوكمڕانی ساسانی دا ٢٢٤-٦٥١ زەردەشتی بۆ ماوەی چوارسەد ساڵ زیاتر حوكمڕان بوو!

لە كتێبی ئافرەت و كەلتوور باسم لە هەژموونی ئەو دینانە لە سەر بیركردنەوەی رەعیەتی ناو كۆمەڵگای كوردی كردووە،لێرەدا تەنیا ئاماژە بە

کاریگەری زەردەشتیەت دەکەم لە سەر بە شوودانی کچ بە گچکەیی ، دۆزینەوەی مێرد لە لای باوك بۆ کچەکەی هەروەها بێوەری کردنی — بارنجکردنی — ڕەگەزی مێ لە هەر سێ هاوسەرگەری پاتیخساهی ( لە حاڵەتی گوێڕایەڵنەکردنی ژنی ئازاد بۆ مێرد) و چاگار ( پاشکۆ ) و خواسرای ( بە خۆ مێرد بۆ خۆدۆزینەوە )

سەرەڕای ئەوەی دەرك بە حاڵەتێکی تەبەقی لەو زەواجانە دەکرێ ، پیاوی کوردی فیودالێ هەوڵی داوە زۆر دیاردەی زەردەشتی بهێنێتە ناو ئیسلامی میللی —کەلتووری لە کچ بەشوودان و بێوەریکردن لە میرات و کۆکردنەوەی چوار ژن لە سەر بنیاتی نادادگەری !

بۆ نموونە لە پرسی هاوسەگیری پاتیخساهی — ژنی خانەدان کە ژن بەرزترین پێگەی بەر دەکەوێ ، کچی زدردەشتی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە نیوەی کوڕی زەردەشتی بەردەکەوێ لە هەندێ دین و کەلتووری دی هەر تەواو بێوەری دەکرێ ، ئەوەتە لە کۆمەڵگای کوردی هەتا حەفتاکانیش زۆر زۆر شەرم بوو ژن لە ماڵەباب و ماڵەمێرد بە تایبەتی لە ماڵەباب بۆ ماڵەمێرد میرات ببات .

کەچی ئیسلام هات میراتی نێر و مێی بەستەوە بە ڕەوشی کۆمەلآیەتیەوە ، نەك زایەندی —ڕەگەزیەوە . بابای فێمینیست بێ ئەوەی ئاگای لەوە بێت ، دێت ئیسلام لە پرسگری میراتدا بە جیاوازی سێکسی تۆمەتبار دەکات .

## خیلافەتی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی

هەرسێ خیلافـەی ئەمـەوی و عەباسـی و عوسمـانی لـە پرسـی " دەسـەلأت " و " دادوەری " جـودا بـوون لـە دەوڵـەتی قورئـان و ڕاشـدی . دەوڵەتی یـازدە سـاڵی پێغەمبـەر دەوڵەتێکی قورئـانی کـرداری بـوو هـەروەها دەوڵـەتی ٣٠ سـاڵی ڕاشـدی درێژەپێـدەر و سـەرەتای کـەڵێنکاری بـوو لـە حوکمڕانی ئیسلامی .

لـەو دوو دەوڵەتـە ( ٤١ سـاڵی حـوکمڕانی ) شـتێك نـەبوو بـە نـاوی (جاریە) و ( سەبایە ) ، بەلأم لە هەر سێ حـوکمڕانی  ئەمـەوی و عەباسـی و عوسمانی پرسی جاریە و سەبایە بە ( شەرعی ) کرا .

ئـەو دیاردەیـە زیـاتر لـە نێـو کۆشـکی بـەناو هەنـدێ خەلیفـە هـەبوو ، چۆن ئێسـتا بـە شـێوەیەکی زۆر بـەربلأوتر لـە نـاو دەوڵـەتی نەتـەوە هەیـە . دوای هەرەسی حـوکمڕانی هەنـدێ سـەرکردەی سـەردەم وەك صـەدام ، مـیری کوێت ، قەزافی...دەردەکەوێت کە ئەو سەرۆکە عەلمانیە عەسکەریانە چـەندان ژنیان لە ژیاندا هەبووە!!

دیاردەی هەبوونی حەرەمسەرا تایبەت بووە بە کۆشکی سـەرۆك ، نـەك ڕەشـۆك ڕەعیـەت ،  لـەم پرسـەدا نووسـەرە بـۆرژوا موسـڵمانەکانیش لۆمـە دەکـرێن ، چـونکە هـەر تـەنیا باسـیان لـە ژیـان و گـوزەرانی بەرپرسـەکان کـردووە ، نـەك ڕەشـۆکەکان وەك مێژوودکـەی تەبـەری ، کـە هـەر بـە نـاوی مێژووی میرەکان و مەلیکەکانە.

جا کـە تەبـەری باسـی ئـافرەتی گـیراوی تـورکی ، نـەفریکی ...دەکـات ، تـەواو جەسـتەی خۆیـان یـا نیـوە جەسـتەی خۆیـان داپۆشـن ، ئـەو قسانەی

تەبەری هیچ دەقێکی قورئان یا فەرموودەیەکی دروست پالپشتی ناکات ، بەڵکو تەنیا ڕایە!

لەو ڕوانگەوە هەبوونی " حەرەمسەرا " لە کۆشکی هەندێ بەرپرس تەنیا دووبارەکردنەوەی ژیانی جاهیلیە ، بۆیە بە ئاسانی هەرمسیان هێنا .

لە لایەکی تریش مەرج نییە ئەو ( حاڵەتەی ناو کۆشك ) بووبێتە ( دیاردەی ناو کۆشك ) ، کاردانەوەی ئەردۆگان و حکومەتەکەی دەربارەی زنجیرەی " حەریم سوڵتان " ، کە کارەکەری کۆشك بە جاریە و سەبایە دەبینی ، بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە .

هەروەها مولکی یەمین تەواو جودایە لە سەبایە و جاریە ، مولکی یەمین بۆ پاراستنی کۆمەڵگایە لە داوێن پیسی و بەرەڵڵایی ، مرۆی زەنگین و کەمدەرامەت دەتوانێ بیانخوازێ ، کەچی سەبایە و جاریە حاڵەتی ناو کۆشکە یا جۆرێکە لە مەشاعیەتی مەزدەکی کۆن و کۆمۆنیستی نوێ ... هەبوونی ئەو دیاردەیە سوکایەتیە بە ئافرەت هەروەها کۆمەڵگا لە ڕووی سێکسیەوە دەڕووخێنێ .

کورتەی قسان هەبوونی مولکی یەمین بە مێ و نێر ڕەنگدانەوەی سیستەمی کۆمەلایەتی و ئابووری قورئانە ، کەچی حاڵەتی سەبایەی کۆشك ( لە حوکمڕانی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و سەردەم ) هەبی یا نەبی بەرهەمی توراسە ، نەك دەقی ئیلاهی وەك قورئان.

دوای دەرکەوتنی ئەوەی جاریە لە دەقی قورئان و دەوڵەتی مەدینە و دەوڵەتی ڕاشدی نەبووە ، ئەوەی لەمەودوا هەبووە بەرهەمی توراسی عەرەبیە ، نەك قورئان سیرە .

دکتـۆر جـەمال نەبـەز ۱۹۹۷ لـە ل۱۹-۲۰ کتـێبی کـوردانی سـەرگەردان (چاپی کوردی ) باسی چەند شتێك دەکات کە دووره لـە دەقـی قورئـان و نزیکە لە توراسی عـەرەبی . مـەوالی لـە زهنیـەتی دەسـەڵاتی عـەرەبی تـەواو جودایە لە تێگەیشتنی قورئانی . لە ئایەتی ٥ ی سوڕەتی مریم باسی مـەوالی لـە نـزای زەکـەریا پێغەمبـەر هـاتووە و انـی خفـت المـوالی مـن وراوی ئەحمـەد کاکـە مـەحموود لـە ل٥٠٢ -٥٠٣تەفسـیری ڕامـان دەربـارەی تەرجومەکردنی ئەم ئایەتە دەنووسێت :" بە ڕاستی مـن لـە دوای خـۆم لـە هـۆز و عەشـیرەت و خزمـانم نیگـەرانم کـە پێویسـت نـەزانن ڕێـز لـە پێغەمبـەرایێتی و زانسـت بگـرن ." عەبدالکـەریم مـودەریس و موحەمەد باموکی بە جیا لە لاپەڕە ۲۰٥ ی تەفسیرەکانیان مەوالی بـە خزمـی لادەر و کـەم توانـا دادەنـێن. ئـەوە تێگەیشـتنی قورئانـە کەچـی بەشـێك لـە دەسەڵاتی ئەمەوی مـەوالی لایـان تـاکی غـەیرە عـەرەب بـوو ، نەبـەز ۱۹۹۷ لـە ل۱۸و ۱۹ و ۲۰ بـە شـێوەیەکی تـر واتـای مـەعریفی و کردەکـی لای ئەمـەوی دەگوازێتەوە :" ئەمەویـەکان سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و زەویـداری بـە سـەر مەوالیـەکان دەسـەپاند لەوانـە یاسـای گزیـە ، ئـەو یاسـایە لـە سـەردەمی خولەفای ڕاشدی کورد و فارسی موسلمانی نەدەگرتەوە ، کەچی ئەمەویـەکان بە سەر کورد و فارسی موسلمانیشـیان سـەپـند. ئـەو مەوالیانـە لـە کۆمـەڵگای عـەرەبی سـووك تەماشـا دەکـران . عەرەبـەکان ئامـادە نـەبوون لـە پشـت مەلایـەکی مـوالی نوێـژ بکـەن ، لـە جەنگیشـدا هێـزی مـوالی دەبـوو دەبوایـە پیادەڕەو بێت ."

ئەو تێگەیشتنە توراسیە لە عالەمیەتی دەقی ئیلاهی هۆکارێك بـوو بـۆ ئەوەی تەمەنی دەوڵەتی ئەمەوی درێژ نە[illegible] .

منـداڵی دوو ڕەگ –هـەجین لـە نێـوان عـەرەب و غـەیرە عـەرەب بـە منداڵی لکەبار دادەنرا ، هـەروەها وەچـەی هـەجین لـە نـاو عەرەبانـدا بێـزراو بووە-ل١٩

ئـەو عەرەبانـەی ئـافرەتی غـەیرە عـەرەبین هێنـاوە زۆر بـووە ، بـەڵام شـۆڤینیەتی عـەرەبی بەرگـەی ئـەو دیاردەیـەی نـەگرتووە ، نەبـەز لـە ل٢٠ کۆپلە شیعرێکی ریانی لەو بارەیەوە دەهێنێتەوە :

ان اولاد السراري كثروا يا رب فينا
رب ادخلني بلادا لا ارى فيها هجينا

ئـەو خەلیفانـەی کارەکـەری خۆیـان هێنـاوە یـا نەبـەز وتـەنی شـۆڤینی بوونانـە لەوانـە عبـدالملك بـن مـروان کـە سـکەی عـەرەبی بـۆ پـارەی عـەرەبی بەکارهێنا هەروەها زمانی پەهلەوی لە دەوڵەت قەدەغە کـرد هـەروەها کەسـی وا هەبوو پێی ڕەوا بوو کە ئەسیری جەنگ بکاتە کۆیلە هەروەها لەگـەڵ کچـی ئەسیری جەنگ جووت بێت!!

ڕای دەقــی ئیلاهــی و سـیرە دژ بــەو بۆچـوونەن ، ئــەو سێکســکاری و کۆیلەکاری بە ناڕەوا دەزانن ، چ لە مرۆڤی لادەر بکـەن ئـەوها مامەڵـە لەگـەڵ ئەسیری نەتەوەی تر بکەن!! هەروەها بوونی ئـەو دیاردەیـە تـەواو نامۆیـە بـە دەوڵەت و پەیامی پێغەمبەر .

هەبوونی حەرەمسەرا یا جاریـە لـە هەنـدێ مـاوەی دەوڵـەتی عوسمـانی بۆتـە هـۆی ڕمـانی جـوزئی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و کێشـە نانـەوە لـە نـاو کۆشك .دیب علی ٢٠٠٧ لە ١٩٥ هەتا ٢٠٧ باسـی ڕوکسـلانا –جاریـەی جوولەکـە لـە دەوڵـەتی عوسمـانی ، صـەفیە-جاریـەی ئیتـالی لـە دەوڵـەتی عوسمـانی. بـۆ نموونـە ڕوکسـلانا دەورێکـی گرینگـی هـەبووە لـە سـەرنج ڕاکێشـانی سـلێمان

قانوونی ١٥٢٠-١٥٦٦ و بۆتە هۆی کوشتنی صەدری ئەعزەم و مستەفای کوڕی سلێمان هەروەها بە سولتانکردنی سلیم —ی کوڕی کە بە گوێرەی زۆر سەرچاوان کوڕی زینا بووە هەروەها ناسراوە بەسوڵتانی سەرخۆش و لادەر.

صەفیەی ئیتالی ناوی دروستی ئیمی دی بافو عەشقی موڕادی سێیەم کە ئەو سولتانە ناسراو بوو بە مێباز ، خەتەری ئەو جاریەیە لە ڕۆکسلانا زیاتر بوو چونکە نەك هەر تەنیا موحەمەدی کوڕی کردە سولتان هەروەها ئەو سولتانە ١٩ برای خۆی لە نێو ١٠٢ برا لە ناوببات.

موحەمەد قوتب لە ل ٨٢ کتێبی با دەربچین لە تاریکایی ... ئەو حاڵەتانە دەرچوون لە تەعالیمی ئیسلام ، ئەگەرنا خودا بڕیاری یەکسانی دەدات لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا هەروەها بە سەر پیاوان فەرز دەکات کە دەبێ بە باشی مامەڵە لەگەڵ ژن —ال عمران ١٩٥ هەروەها لە ل٨٥ چەند فەرموودەیەك دەهێنێتەوە لەوانە باشترینترینتان باشترینتانە بۆ خێزانەکەی ...بێوەژن مارە ناکرێ هەتا پرسی پێنەکرێ کچیش مارە ناکرێ هەتا پرسی پێنەکرێ ...ئافرەت تەواوکەری پیاوانن...چاوتێبڕین لە ئافرەت حەرامە.

ئەو سووك ڕوانینە و لکەدارکردنەی ئافرەت تەواو دوورە لە فەرمایشتەکانی قورئان و سیرە. لە لایەکی دی لە ڕوانگەی دکتۆر هادی عەلی یەوە دەوڵەتی نێو قورئان دەوڵەتی مەدەنیە. ئەو ڕاستیە لە سەردەمی هاوچەرخیش دووپاتکراوەتەوە ، سەیری کتێبی دەوڵەتی مەدەنی لە دیدێکی ئیسلامیەوە بکە.

قۆزتنەوە و گەورەکردنی پرسی ژن بە گشتی نەك تەنیا کەنیزەك لە گۆڕینی ئاراستەی مرۆڤەکانە لە سەر ژیانی ئافرەتی ڕۆژئاوا و دینە دەسکردەکەیان . لە تەورات و ئینجیل و بوزا بە خراپترین شێوە باسی

ئـافرەت کـراوە وەك ئـافرەت نابێـت لـە کەنیسـە قسـە بکـات یـا دەربـارەی دینەکـەی بپرسـێ . هـەر ئـافرەت بـوو گـەورەترین بـەڵای بـە سـەر مـرۆڤ هێنا......

قـۆرخکردنی ئـافرەت لای پیـاو لـە ڕۆژئـاوا مێژوویـەکی ڕەشـی هەیـە لەوانـە مەسـعود عبـدالخالق ۲۰۱٤ ، ل ۲۹ بـاس لـەوە دەکـات کـە بەزانـدنی پـەردەی کچێنی ئـافرەت لـە ئـەوروپا تـا سـەدەی ۱۷ بـەردەوام بـووە ، کەچـی مـارف خەزنـەدار لـە کتـێبی ١٤ی تـەمووزی شۆڕشـی فەرەنسا دەڵێـت هـەتا سەدەی ۱۸ لە کەنیسە هەبوو .

ئـەو بەزاندنانـە زیـاتر لای مـەلیك و قەشـە و بەرپرسـەکان بـووە وە هەندێ جار ئەو مهامە دەدرایە فەیلەسوفەکانی سەر بـە دەسـەڵات . مەسـعود لە هەمان لاپەڕە باس لەوە دەکات کە ئـەو کـارە لای مـالکۆلی سـێیەم –شـای ئیقۆسیا کراوەتە یاسا . مالکۆلی سـێیەم ۱۰۵۷-۱۰۹۳ بڕیـارێکی فـەرمی دەرکـرد تیایـــدا مـــافی شـــەوی یەکـــەمی بـــووکێنی پیاومـــاقوولانی بـــۆ خـــۆی و جێنیشینەکانی قۆرخ کرد،بەڵام بـووکیماڵە هـەژارەکانی بـۆ ئەوانیـدی دانـا-ل۲۸ .

ئەو هەموو کارە قێزەونەی ڕۆژئاوا لە بارەی تێکسـتی دیـنی و فەلسـەفی و یاساییەوە و کرداریـەوە ناوچـەوانی بەشـێکی کـەم لـە ئـەو " خەلیفـە " لادەر و سولتانە سەرخۆشانەی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و عوسمـانی سـپی ناکاتەوە دەربارەی قۆرخکردنی ئافرەتی کەنیزەك و کۆیلە .

زەبـر و زەنـگ لـە سـەر ڕەگـەز دانەمـەزراوە بـەڵکو لـە سـەر جیـاوازی چینایەتی

لە نێو کۆمەڵگا چەند چین و توێژێك هەن ، لەوانە چینی دەسەڵاتدار ، چینی خواپێداو ، چینی وردە بۆرژوا –مووچەخۆر ، چینی پرۆلیتار : هەژار و فەقیر خاوەن قووتی لایەموت –مەمرە مەژی .

کەسەکانی ناو ئەو چینانە دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی بۆ خۆ دروست دەکەن ، کە هیچ پەیوەندی بە جێندەرەوە وەنییە .گومان لەوە دانییە ئافرەتی ناو کۆمەڵگای وردە بۆرژوا و پرۆلیتار پێگە و توانای سیاسی و کۆمەڵایەتی چینی دەسەڵاتدار و دەرەبەگ و سەرمایەدار نییە هەروەها چەوساندنەوەی جەستەیی ئافرەت زۆریی لە کۆمەڵگای یەکەمەوە لە لای پیاوی چینەکان هەیە ، هەر ئەوانن بازرگانی بە جوانی ئافرەت لە هەموو سەردەمەکان دەکەن !

بۆ نموونە لە نێو چینی دەسەڵات و خواپێداو ئافرەت ی ( مێ )وەك (زەنوبە ی تەدموری ) ، ( کلیۆپاترای مصری ) ، ( بەلقیسی سەبەئی ) ، (ئیڤلتیتی کورد )... هتد هەن ، ئەوانە هەزاران پیاوانیان ( نێر )لە ژێر دەست بوو ، کەچی لە نێو چینی خوردە بۆرژوا و پرۆلیتار لە هەموو قەومێکدا هەزاران ژن ( مێ ) لە ژێر دەستی یەك پیاودا ( نێر ) هەن ، بۆ نموونە لە تەورات باس دەکرێ سلێمان ١٠٠٠ ژنی هەبووە هەروەها لە مێژوو باس دەکرێ خەسرەوی دووەم ، باوکی پوران دۆخت و ئازەر دۆخت و دۆستی شیرین لە سەرەوەی ٣٠٠٠ کەنیزەکی هەبووە! کەچی سیکیولەر و فێمینیستی کورد هێندە عەشقی چیرۆکی ئەڤینی ( خەسرەو شیرین )-ە چەندان بەندی لە سەر دەڵێت !! ئایا ڕەعیەتی جوو و زەردەشتی وەك " سلێمانی تەورات " و خەسرەوی ناو مێژووی ساسانی ژیاون ؟؟! لەمەدا دەفامرێتەوە کە بوونی زەبروزەنگ و ناعەدالەتی پەیوەندی بە چینەوە هەیە ، نەك ڕەگەز!

لە نێو چینی پرۆلیتاردا کەسانێك بە ناوی ( دۆم ) ، ( قەرەج ) ، ( قەپقاسی ) ، ( ڕۆمی –ڕۆمانی ) هەن ، بۆ نموونە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد لە لاپەڕە ٦٩٤ دەربارەی وشەی گیپسی دەنووسێت : " هەندێ جار ئەم وشەیە تاوانە ، بۆ زویرکردن و کەمکردنە دوو واتای هەیە ١.ئەندامی ڕەگەزی خەڵکانێکن کە سەرچاوەکەیان لە ئاسیا هەڵقولاوە کە بە شێوەیەکی سونەتی شێوە گەرۆکین و لە کەرەڤانە ، ڕەشماڵ دەژین . زۆر خەڵك وای پێ پەسەندە کە ڕۆمایی یا ڕۆمانی بەکاربێن . واتای دووەم ، گەڕۆك –گەڕیدە دەگەیەنێت."

فەرهەنگی ئازادی لە لاپەڕە ٤١٣ لە بەرانبەر وشەی گیپسی وشەی ( قەرەج ) ( قەرەجانە ) دادەنێت ." هانزیکۆن فویکت لە ل٩و١٠ی نامیلکەی شیعری قەرەج دەنووسێت : " قەرەج پەیوەندی بە یەزدانەوە لەوانەیە دڵنیاترین پەیوەندی بێت ، دیندارە بێ ئەوەی دینی هەبێ ...هێندە گەرۆکە بە ولاتان بۆیە خودایەکی نەدۆزیتەوە " ئەو سیفەتە بێ شوناسی و بێ زیدیە وای لە مرۆی شار کردۆتەوە کە بیر لە هاوسەرگێری مێی قەرەج نەکاتەوە!

لە هەولێری باشووری کوردستان هەرسێك وشەی ئاسیایی لە یەك جیا دەکرێنەوە ،، (دۆم )لە پاش حەفتاکانەوە تێکەڵی کۆمەڵگا بوونەوە، ئێستا کۆمەڵگایەکی دۆمی نەماوە ، بەلاّم هێشتا دیاردەی هاوسەرگیری مرۆی شاری و کچی دۆم دەگمەنە یا بە پێچەوانەوە!

هەرچی قەرەج و قەپقاسی –یە هەر لە دەرەوەی کۆمەڵگا ماونەتەوە وەك گوتمان تەواو ساخ نەبۆتەوە هەڵگری چ شوناسێکی کۆمەڵایەتی و ئەتنیکین یا لە بنەڕەتدا ئەفریکی ، میصری یا هیندین ؟ لە سەرەتای دوو هەزارەکان هونەرمەندانی سلێمانی فلیمێکیان دەربارەی قەرەج لە کوردستان دەرهێنا . لەو فلیمە دەردەکەوێت کە قەرەج کۆمەڵگایەکی داخراویان هەیە

هەروەها عورف و عادەتیان لە شارییەکان جودایە ، ئەو کوڕە شارییەی لە فلیمەکە عەشقی کچە قەرەجێك دەبی ، هەر خۆی بە گومانی( ناپاکی) ژنەکەی خۆی دەکوژێت !!

زۆربەی ئەندامەکانی کۆمەڵگای شاریی بە چاوێکی تر تەماشای قەرەج و قەپقاسی و ڕۆمایی دەکەن ، بە جۆرێك زۆر کەم هەڵدەکەوێ شارییەك یەك لەوان بخوازێت یا بە پێچەوانەوە ، کەواتە ژن و ژنخوازی ئەو قەومانە هەر لە نێو یەك دەبێت. ئەو داخراویە داخراوی کۆمەڵایەتیە نەك داخراوی دین جیاوازی وەك موسڵمان و ئێزیدی یا نەتەوە جیاوازی وەك کورد و قەپقاسی.

لە لایەکی تر ئەو جیاوازی تەبەقی و کۆمەڵایەتی و ڕەگەزی و ئابووریەی لە نێو منداڵدانی شارستانیە کۆن و نوێیەکاندا هەیە ، سیستەمێکی ستەمکاری هێناوەتە وجود . چۆن ؟ سۆڤیەتی کۆن زیاتر لە حەفتا ساڵ لە حوکمڕانی بە ستەمی جیاوازی چینایەتی بەڕێوەچوو ، لە هیند ئێستاش بە حوکمی جیاوازی کۆمەڵایەتی بەڕێوەدەچێت . کاپیتالیزمی ئەوروپی لە سەر سەرمایەی جەستەیی و دراوی دامەزراوە ، ئێچ .جی وێلز تەواو دەرکی بە سەرمایەداری ئەوروپی کردبوو بۆیە ڕۆمانی کیپسی بۆ ڕیسواکردنی ئەو شارستانیە ئابووریە !

لە نێو ئافرەتی کوردیش درك بەو جیاوازیە تەبەقی و ستەمکاریە دەکرێت ، برهان قانع ئامازە بەو ستەم و بێوەریە لە ئافرەتی وەرزێر و عەشائیر دەکرێت . واقیعی فیودالی کوردستانیش ئەو ڕاستیە پشڕاست دەکاتەوە . ئەو ستەمە لە ئافرەت هەر تەنیا لە چینی خوارەوە بووە ، ئەوەتە دکتۆر کوردستان موکریانی لە ل٧-٩ی نامیلکەی باری سیاسی ئافرەتی کورد لە باشووری کوردستان ئامازە بە دوو ئافرەتی چینی دەسەڵاتدار ، حەپسەخانی نەقیب و عادیلەخانم دەکات ، کە نەك هەر دەیان

پیاویان لە ژێر دەستدا بووە ، دەورێکی سیاسیان هەبووە ، بۆ نموونە حەپسەخانی نەقیب ئامۆزا و برا ژنی شێخ مەحموود بووە ، ئەو ژنە هێندە نزیك لە بڕیاری کوردی نامەی بۆ کۆمەڵەی گەلان لەمەڕ دۆزی کوردەوە ناردووە . لەولاوە عادیلە خانم بە ئامادەبوونی عوسمان پاشای هاوسەری و مردنی پیاوەکەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ حوکمڕانی هەڵەبجەی کردووە . ئەو ئافرەتە بە خۆی و کوڕەکانیەوە ئەحمەد موختار بەگ و تاهیر بەگ ، دوژمنی سەرسەختی شێخ مەحموود بووە ، بۆیە دەسەلاتی ئینگلیز لە عیراق نازناوی " هیندی –خان بەهادۆری پێ دەبەخشن ."

جیاوازی ئیمانی ، کە خۆی لە تەقوا دەبینیەوە ، خودا دەیەوێ لە زاتی مرۆڤەکان بە تایبەتی موسڵمانەکان تەوزیفی بکات . ئەو پلە بەندیە ئیمانیە لە نێوان تاکە موسڵمان و نا موسڵمانەکان دەرکی پێدەکرێت ، بۆیە دەبینین لای هەندێ توێژەر ما ملکت ئەیمانکم ئافرەتی ئیمانداری ئاینی ترە ، ئەو جۆرە ئافرەتە ئافرەتی ناچاری زەواجە ، بۆیە دەبینین بەستراوەتەوە بە " دەستکورتی " ، " ناچاری " ، نەك وەك ئافرەتی موسڵمانی ئازاد ! ئەو عزەتەی بە مرۆی موسڵمان دراوە لای خودا ، موسڵمان خۆی بنپێی دەخا ! لە ئەمریکا و زۆربەی دەوڵەتی ئەوروپی مرۆی ڕۆژهەلاتی ناوین بە " سەر ڕەش " ، " موسڵمان : تیرۆریست " ، " شەرقی "... ناوزەد دەکرێت ، ئەو لەبەر دکتاتۆر و فیرعەونەکانی ڕۆژهەلات هەر قەبوڵی دەکات ! ئایا ئەو دکتاتۆرانە بەرهەمی ئایدیۆلۆژیا و بەرژەوەندی ڕۆژئاوا نیین؟؟

وروژاندنی ئەم کەیسە بۆ ئەوەیە کە ئەو جوداميراتی جێندەری و داخراویە –جڤاکیە لە سەردەمی پێغەمبەریش هەر هەبووە هەروەها گومانمان وایە کە هەردوو زاراوەی ( ما ملکت ایمانکم - مێ ) و ( ما ملکت ایمانهن-نێر ) گوزارشت لەو داخراوە جڤاکیە دەکەن .

## مەلەفی کەنیزەك یا مولکی یەمین

خودی ئەم کتێبە بۆ قسەکردن لە سەر مولکی یەمین –کەنیزەك نووسراوە . قورئان و فەرمووده و ئیمام عومەر واتەنی مرۆ بە ئازادی و موسڵمان لە دایك دەبێ ئەوە کۆمەڵگا و بکەرەکانی کۆمەڵگان تەڵقینی دەدەن بە ئایدیۆلۆژیای هەناوی پراگماتیکی شوێن ، بە واتایەکی تر کۆمەڵگای جوو ، منداڵ دەکاتە جوو ، مەسیحی دەیکاتە مەسیحی ، هیندۆسی دەیکاتە هیندۆس ...هەروەها شیوعی دەیکاتە شیوعی !

ئەو هەموو کۆمەڵگایە تەواو بە پێچەوانەی قورئانە لە بریتی باوەڕ ئایدیۆلۆژیایەك بە بێ ئیرادە و ویستی خودی منداڵ ، منداڵەکە لە پرۆگرامی خودا دوور دەخەنەوە ، بە پێی هەندێ تیۆری سایکۆلینگویستیك ئەو مێشکە سپیەی منداڵ تەواو جەنجاڵ دەکەن بە ئایدیای دژی فیترەت .

هەر ئەو کۆمەڵگا دوورە خودایە ڕێسایەك بە ناوی دەستوور دادەڕێژێت ، ململانێی تەبەقی دەچینێت ، لە ئاکام هەندێ لە بکەرەکانی ئەو کۆمەڵگایە دەبنە خانەدان –نۆبلمان ، مەسعود موحەممەد واتەنی ئەدەبیشی لە ئەدەبی چینی خوارەوە جودا دەبێت .

خانەدان و مولکی یەمین –کەنیزەك لە کۆمەڵگا زادە و بەرهەمی توند و تیژی لە لایەك ، بەرهەمی ساماندارى و زەویداری و پارەداری کۆمەڵگای فیودالی و سەرمایەدارین لە لایەکی تر.

بە حوکمی ئەوەی توراس و تەفسیری توراس ئەوەندە وێنەی مولکی یەمین –کەنیزەکیان شێواندووە ، توراسی عەرەبی هەر بە ڕاڤە و چاوی جاهیلی شرۆڤەی چەمکەکەی بە جاریە و حەرەمسەرا کردووە ، زۆر

تەفسیری کوردیش ئەو ڕاڤەیەی تەفسیری توراسی عەرەبیان گواستۆتەوە زاکیرەی ئینسانی کوردی ، کەواتە مولکی یەمین چیە؟؟

## چەمکی ماملکت ئە یمانکم-مولکی یەمین

فرێز و دەستەواژەی ما ملکت یا مولکی یەمین لە دوو وشە پێکهاتووە کە دەلالەت لە دوو هێز و شیانی بەندە دەکات هەروەها مانەوەی بەندەکەش بە سۆز و بەڵێنێکە . عەبدولقەهاری شێخ ٢٠١٥ ، ل١٦٤ ئاوا لە پێکهاتەی مولکی یەمین دەدوێت: " مولك بۆ تەملیکی جوهد و کۆشش و توانا و بەهرەی مرۆڤەکەیە نەوەك بە خاوەنبوونی ئیرادە و ئازادی و بیرکردنەوە و مرۆڤبوونی ، یەمینیش پەیمان و بەڵێن و ئیتیفاق و موعامەلە و پێکهاتن و ڕێککەوتنە بە ڕەزامەندی هەردوولا لە سەر ئەو کار و پرۆژەی لە سەر ڕێك دەکەون ." یا واتە ئەو کەسانەی بە سوێند و پەیمان دێنە ماڵەوە بۆ کارکردن چۆن مرۆڤێك بە سوێند و پەیمانی نهێنی پاراستنی کۆمپانیەوە دەچێتە دامودەزگایەك .

مولکی یەمین دەرهاوێشتەی باری ناڵەباری کۆمەڵگان . مولکی یەمین بە زۆری دایك و باوکیان دیار نییە یا جیابوونەوە یا یەکیان مردووە ئەوی تر لە توانای نەبووە منداڵەکەی خۆی بە خێو بکات یا منداڵی نێر و مێی کۆمەڵگای ترن .

لە لایەکی دی ئەو مولکی یەمینە لە کوردیدا بە کەنیزەك بەناوبانگە ، بابزانین کەنیزەك چییە؟

زۆر پێناسە بۆ وشەی کەنیزەك کراون . وشەکە لە بنەڕەتدا لە کەنیزی فارسی وەرگیراوە . لەو هەموو فەرهەنگە کوردی و فارسیە دەردەکەوێ کە ئافرەتی کەنیز ئازاد نییە ، بەڵکو کارەکەرە .

شێخ موحەمەدی خاڵ لە ل٣٨٥ی چاپی ئاراس دەربارەی سینۆنیمی کەنیزەك دەنووسێت کارەکەر ، گیو موکریانی لە ل٧٥٧ ی فەرهەنگی کوردستان دەنووسێت : کەنیزەك یانی کەنیز ، کارەکەر ،کڵفەت ، قەرەواش هەروەها هەژار موکریانی لە ل٦٧١ی هەنبانە بۆرینە دا دەربارەی کەنیزەك دەنووسێت : کەنیز قەرەواش خدامە ژنی بە پارەکڕدراو ، ماجد مردووخ روحانی لە ١١١٥ای فەرهەنگی فارسی –کوردی دانشگای کوردستان دەنووسێت : کەنیزەك لە وشەی کنیزی فارسی وەرگیراوە بە واتای کەنیز ، کەنیزە ، کەنووژ ،کۆلا ، ژن یا کچێك کە کۆیلەیە."

هیچ قاموسێك لەو قاموسانە وشەی کەنیزەك نابەستێتەوە بە سێکس و سێکسی ئازاد ، کەواتە کەنیزەك زۆر نزیکە لە دیاردەی مولکی یەمین !

ئەمەی سەرەوە دیتنی قورئانە دەربارەی کەنیزەك-کارەکەر لە کۆمەڵگادا . ئەو ڕەوشە خزمەتکاریە و دەستکورتی و دوور لە ماڵی سەربەخۆی خۆی ، یاسای خودا وایە کە سزاکەشی نیوەی سزای مرۆی ئازاد بێت .

لە لایەکی تر لە زۆربەی کتێبی توراسی عەرەبی ما ملکت ئەیمانکم بە " دیلی جەنگ " بە تایبەتی ئەوانەی ناسراون بە سەبایای شەڕ دانراون . بۆنموونە لە سورەتی مۆمنون باسی مولکی یەمین کراوە . کە لە کۆنتێکستی شوێنی ئایەتەکە وردەبینەوە پێکەنین دامادەگرێت ، ئاخر سورەتەکە بە گشتی مەککیە ! موسڵمانەکان لە بەر جەبرو جەبەڕووتی دەسەڵاتی ئەبو جەهل زۆربە بەرەو حەبەشە و مەدینە کۆچیان کرد ،باسی قیتال و ئەسیری جەنگ هەر بوونی نەبووە !!

توراس پەرستەکانی سعودیە لە زۆر لەو تەفسیرانەی لە سعودیا چاپکراون وشەکە بە ئەسیری جەنگ شرۆڤە دەکەن ، لە باشووری کوردستانیش بە سەلەفی و غەیرە سەلەفی ئایەتەکە بەو سەقەتیە شرۆڤە دەکەن . وەك گوتمان ئەو تێگەیشتنە هاتۆتە ناو تەفسیری قورئان بە کوردیش ، بۆ نموونە بڕوانە تەفسیری نامی لە ئایەتی ٢٤ ی سوڕەتی ئەلنیساء . ئایا ما ملکت ئیمانکم ئەسیری جەنگ دەگەیەنێت؟؟ ئایەتێك لە قورئان نییە کە پاڵپشتی ئەوە بکات ، ئەو تێگەیشتنە لە توراسی سەرچاوەی گرتووە ، نەك قورئان . لە پرسی دیلی جەنگ دوو دیاردە هەن ، کە بریتین لە :

١. ئازادکردنی بێ بەرانبەر

٢. وەرگرتنی فدیە

ئەوەی دوایی لە جەنگی بەدر جێبەجێ کرا . هیچ دەقێکی قورئانی نییە باس لەگڵدانەوەی ئەسیر و بە کۆیلەکردنی ئەسیر بکات ، بە تایبەتی ئافرەت و منداڵ . لە پاش دابەزینی قورئان ئەو دوو دیاردەی پێشتر هەبوون لە نیوە دوورگەی عەرەبی : کۆیلەیی و کەنیزەیی بە تەواوی لە یازدە ساڵی حوکمڕانی خۆشەویستدا بنەبڕکران ، هەرگیز سەحابەیەك نادۆزیەوە کە کەنیزە و کۆیلەی هەبووبێت . قەهاری شێخ لە ل١٦٢ ئەو ڕاستیە پشتڕاست دەکاتەوە بەوەی " هەرگیز لە دوای دابەزینی وەحی یەك تاقە پیاو نەکراوەتە عەبد و یەك تاقە ئافرەتیش نەکراوەتە کەنیزەك بە پێی فەرمانی ئیلاهی " ئەوەی هەبووە تەنیا لای دەسەڵاتی عەرەبی جاهیلی بووە.

قسەکردن لە سەر ( مێ ) سنووری مێژووی تێپەڕاندووە هاتۆتە ناو فیقە . دکتۆر مەحمود ئیسماعیل لە کتێبی اشکالیە المنهج...بە دەرکەوتنی

مێـژووی ئیسـلامی ، کـە زادەی چـینی ناوەنـدی ئیسـلامی بـوو لەگـەڵ خـۆی هـەڵگری ململانێـی نێـوان فیـودالی کاربەدەسـت و بورجـوازی ئیسـلامی بـوو هەروەها دکتۆر مەحمود بـاوەڕی وایـە کـە لـە نێـو مەدرسـەی زاهراتـی ئیبن حزمـی ئەندەلوسـییدا جـەدەلێك لـە نێـوان فیقـە و مێـژوو دا خـۆی مـەلاس داوە ." فیقـە و مێـژوو لـە ڕواڵەتـدا لـە یـەك دەچـن ، هـەردووك لـە ژێـر چـەتری تـوراس کۆدەبنـەوە ، جیـاوازی بنـەڕەتی نێوانیـان ئەوەیـە فیقـە بـە قەڵـەمی پیـاو بـە پاڵپشـتی تێگەیشـتن لـە قورئـان و فـەرمووده داتاکـان داڕێژراون ، هەرچی داتای مێژووییـە زۆری بەرهـەمی عـەقلی شـرۆڤەکاری و گواستنەوەیە . تۆمـەتبارکردنی فیقـە بـە ( پیاوسالاریی ) و ( سـەردەمیی ) ، دوو ئەگـەری کۆنکریتیـە : پیاوسـالاریە ، نـەك سـتەمکاریی چـونکە فیقـە شـرۆڤەکاری پیـاوە بـە دەگمـەن ئافرەتێـك لـە نووسـینەوەی دەبـینی . سەردەمییە چونکە شرۆڤەکاری دەقی ئیلاهی نەبەسـتراوەتەوە بـە چـەرخێك یا سەردەمێکی تەکنەلۆژی ، بـەڵکو هـەتا قیامـەت دەقـەکان شـرۆڤەی جیـاواز لەوی پێش خۆ هەڵدەگرن . پرۆفیسۆر دکتـۆر مستەفا زەڵمـی ٢٠١٥ لـە ل١٥ و ١٦ی کتـێبی وشـککردنی زەلکـاوی....دەنووسـێت : " بانگهێشـت کردنـی دەسەلاتدارە موسڵمانەکان و زانایانی ئایینی بۆ چاوخشاندنەوە بـە نووسـینی فیقهی ئیسلامی مەزنـدا و پاککردنـەوەی لـە نموونـە کۆن و بەسەرچـووەکان چونکە ئـەو فیقهـە بـە وێنـەی کانزایـەکی ئاڵتوونیـە کـە تێکەڵـە بـە خـۆڵ و پاشماوە زیادە، وە ئەگەر بژار بکرێت و پوختەبکرێتەوە لەو کـەم و کورتی و ناتەواوسـانە ئـەوا دەبێتـە سەرچـاوەیەکی بـەپیت بـۆ یاسـاکانی جیهـانی ئیسلامی و نا ئیسلامیش ."

## مولكی یەمینی مەككە و مەدینە

واتاكانی مولكی یەمین بە پێی شوێنی ئایەتەكە ، كە ناسراوە بە كۆنتێكستی مەكانی و زەمانی و زمانەوانی دەقەكە دەگۆڕێت . لەو هەموو ئایەتەی قسە لە سەر هاوسەرگیری بەدیل دەكەن ، هەموو ئایەتی مەكین . ئایا لە مەككە ڕەوشی موسڵمان هی ئەوە بوو جاریەی هەبێت؟؟ ئایا موسڵمان هەتا شەڕی بەدر هیچ دەسەلاتێكی عەسكەری و سیاسی هەبوو ، هەتا جاریە و دیلی شەڕی هەبێت؟؟!

لە لایەكی دی پرۆسەی هاوسەرگیری مولكی یەمین هەردوو مەرجی (مارەیی ) و ( لە ئەهل داواكردنی ) تێدایە بە دەقی ئایەت هەروەها ئایەتی " چەند-ژنی " —سورەتی نیساء لە ( مەدینەی منەوەرە ) دابەزی ، نەك ( مەككەی مبارك ) !

دوای هیجرەت بەرەو مەدینە ، لە مەدینە دەسەلاتێكی مەدەنی لە نێوان موسڵمان و منافیق و جوو و نەصرانی دروست بوو . لە ماوەی ١-١١ ی كۆچی ژیانی مەدینە وەك تەحسین غەریب گوتەنی بە سەركردایەتی پێغەمبەر بووە پێغەمبەرستان . كۆمەڵگای مەدینە بەرە بەرە گەورە بوو ، ئەو دەمەی پێغەمبەر بەرەو مەككە هات دە هەزار چەكداری لەگەڵ بوو هەروەها زۆربەی قیادەی مەككە ناچار بوو بەبێ شەڕ موسڵمان بێت بە تایبەتی ئەبو سفیان و هیند .

لەو كۆمەڵگا مەدەنیە دا ، ئەهلی كیتاب هەبوو ، موسڵمان دەست كورت بۆی هەبوو كچی ئەهلی كیتاب بۆ خۆی بخوازێت —ئایەتی ٢٤ و ٢٥ی نیساء هەروەها هەندێ كەم دەرامەت ( لە موسڵمان و ئەهلی كیتاب ) لە باڵیغ و غەیرە باڵیغ لە ناو ماڵی موسڵمانی هەبوو ( زەنگین ) . لە نێو باڵیغەكاندا ، پیاو و ئافرەتی ئازادی موسڵمان دەیتوانی ئیش بەو خزمەتكار و كاركەرانە بكات وەك چۆن ئەمڕۆ لە كەنداو و مالیزیا و ئەمریكا... هەبووەكان ئیش بەو مولكی یەمینانە ڕادەسپێرن .

## واتا جیاوازەکانی موڵکی یەمین لە قورئاندا

توراسی عەرەبی واتای موڵکی یەمینی لە ئەسیری جەنگ کردۆتەوە ، بەلام قورئان بە هیچ جۆرێك ئاوا مولکی یەمین پێناسە ناکات لە چەند ئایەتدا مولکی یەمینی بە هەردوو ڕەگەز بە ستۆتەوە هەروەها هەردوو ڕەگەز مولکی یەمینیان هەبووە ، بە شێوازی تر مولکی یەمین هەم مێ یە و هەم نێر هەروەها مرۆی ئازادی موسلمان لە مێ و نێر مولکی یەمینی مێ و نێریان هەبووە .

مولکی یەمیین ١٣ جار زیاتر لە قورئان هاتووە ، زۆربەی ماناکان بە گوێرەی کۆنتێکستەکەیە —سیاقی زمانەوانی و شوێنی ئایەتەکەیە:

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت | کۆنتێکست | مانا |
|---|---|---|---|
| ئەلنیساء | ٣ | چەندژنی | قەرەج —رەعییەت [(١)] |
| ئەلنیساء | ٢٤ | ماردیی | قەرەج [٢(٢)] |
| ئەلنیساء | ٢٥ | دەستکورتی | کیتابی —جوو — مەسیحی |
| ئەلنیساء | ٣٣ | میرات | میراتگر |
| ئەلنیساء | ٣٦ | چاکە لەگەڵ کردن | وەرگر |

ئەم سورەتە مەدەنیە قسە لە سەر ڕێکخستنی خێزان دەکات ، لەم خێزانەدا ژن و ٣ڕەعیەت و کتابی و میراتگر و چاکە وەرگر هەیە .

١. فان خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو ما ملكت ايمانكم- ٣ النساء
٢. وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۖ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ ۚ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا - النساء (٢٤)
٣. وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۚ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ –النساء (٢٥)
٤. الْوالِدانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمانُكُمْ)- النساء ٣٣
٥. واعْبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوالِدَيْنِ إِحْسانًا وَبِذِي الْقُرْبى وَالْيَتامى وَالْمَساكِينِ وَالْجارِ ذِي الْقُرْبى وَالْجارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَما مَلَكَتْ أَيْمانُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ مَنْ كانَ مُخْتالًا فَخُورًا - النساء (٣٦)

٦. وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ –النحل (٧١)

٧. إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ – المؤمنون (٦)

٨. وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ –النور (٣١)

٩. وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ- النور (٣٣)

١٠. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ۚ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ - النور(٥٨)

١١. { ٢٨ - ٢٩ } { ضَرَبَ لَكُمْ مَثَلًا مِنْ أَنْفُسِكُمْ هَلْ لَكُمْ مِنْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنْتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنْفُسَكُمْ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ❖ بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَمَنْ يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ- الروم

١٢. وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ) [الأحزاب:٥٠

١٣. ولا ما ملكت ايمانهن- الاحزاب- ٥٥

١٤. او ماملكت ايمانهم- المعارج - ٣٠

لەم ١٤ ئایەتە تەنیا ٤ ئایەتی بۆ هاوسەرگیری مرۆی موسڵمانە ، ئایەتێکیشی بۆ پێغەمبەرە .

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت | کۆنتێکست | مانا |
|---|---|---|---|
| نەحل | ٧١ | چینایەتی | کەم دەرامەت ( مەکیە) |
| ئەلمۆمنون | ٦ | زەواجی مولکی یەمین و ڕێگرتن لە بەرەڵلایی | پلە بەخشین(مەکی) |
| نور | ٣١ | ناو کۆشك | خـــولامی نابـــالّغ یـــا پەککەوتـــە و دوور لـــە سێکس |
| نور | ٣٣ | ڕەعیەتی پاك | —مەدەنی |
| نور | ٥٨ | کەسانی ناو کۆشك | کارەکەر و ڕەنجبەر |
| ڕۆم | ٢٨ | بازرگانی | ســـەپان و ســـەرکار و شوان و گاوانی —مەکە |
| ئەحزاب | ٥٠ | تایبەتە بە ژنەکانی پێغەمبەر کە دەتوانن لە بەردەم کەنەفت و پەککەوتەی مرۆڤی ناو ماڵ سەری خۆیان کۆت بکەن | |
| ئەحزاب | ٥٥ | ئەوانەی سەر ڕووتکردن لە بەرانبەریان جائیزە | خولام – مەدەنی |
| مەعاریج | ٣٠ | هاوسەرگیری خولام – خزمەتکار | مەکەیی |

وەك لە هێلکاریەکە دەردەکەوێ ژمارەی سورەتی مەکەیی لە مەدینەیی زیاترە لەم بارەیەوە:

-نیسا مەدینەیی – نەحل مەکەیی

ئەلمؤمنون مەکەیی -نور مەدینەیی

– ڕۆم مەکەیی -ئەحزاب مەدینەیی

– مەعاریج مەکەیی

لەو هەموو ئایەتەدا تەنیا چەند ئایەتێك وەك بەشێك لە سورەی نیسا و نەحل و مؤمنون و مەعاریج ئاماژە بە هەردوو زەواجی ئەهلی کتاب و چینی هەرە خوارەوەی کۆمەلگا دەکەن کە ناسراون بە هاوسەرگیری ناچاریی ، کە خودا زۆر بە پەسندی نازانێت!

وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا : مولکی یەمین لە هەردوو ڕەگەز هەیە هەروەها نێر و مێی خودا پێداو مولکی یەمینی هەبووە ، بە واتای چۆن پیاو ی زەنگین مولکی یەمینی ژنی هەبووە بە هەمان شێوەش ژنی دەولەمەند مولکی یەمینی نێری هەبووە هەروەها مولکی یەمین لە هەردوو کۆمەلگای مەککە و مەدینە بە واتای جیاواز هەبووە.

نموونەیەکی زیندوو لە بەرجەستەکردنی مولکی یەمین لە چەرخی نوێدا ، زنجیرە دۆبلاجکراوی تورکی بە ناوی ئەلیف –ە لە تەلەفزیۆنی چارە :

١. مەلەك : كارەكەر و ژنی كەنعانی ئەرسیتۆكرات ( مێی كارەكەر + نێری ئەریستۆكرات) !

٢. زمینەب : هەژار و گارسۆنی كافتریاكان و دڵبەری سەلیمی ئەریستۆكرات ( وەك سەرەوە )

٣. عائیشە : كارەكەر و سەركاری ناوكۆشك

٤. خونچە : كارەكەری تایبەت بە ئارەزووەكانی (ئارەزوو)ی ژنی كەنعان هەروەها سووتاوی یەك لایەنەی سەلیم (خزمەتكار+ئەریستۆكرات)

٥. كیراز : كارەكەر و شیو لێنەری كۆشك

٦. صادق : پیاوی مەلیك و كەنعان لە یەك كاتدا

بوونی ئەو هەموو كارەكتەرە مولكی یەمینە تەنیا لە ناو یەك كۆشك .

مهندس عەدنان رەفاعی چەند نموونەیەکی قورئانی هێناوەتەوە ، ئەو نموونە قورئانیانە دەکرێ بە خاڵ قسەیان لە سەر بکەین :

## یەکەم ، ئافرەتی ئیمانداری ئەهلی کیتاب

لە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەراییدا ، ئەو ئافرەتە جوو و مەسیحیەی لە ژێر حوکمی ئیسلامی دەژیان بۆیان هەبوو لە سەر دینی خۆیان بمێننەوە و شوو بە پیاوی موسڵمان بکەن ، نەك بە پێچەوانەوە . بۆ ؟ پیاوی موسڵمان باوەڕی موتڵەقی بە هەموو پێغەمبەرەکان هەیە لەوانە پێغەمبەری جووەکان و مەسیحیەکان ، بۆیە ئەو پیاوە بە ناچاری ، دەستکورتی ، زۆر بۆ هێنانی سێکسی ، کچی جوو و مەسیحی بێنن ، بەلاّم کوڕی جوو و مەسیحی باوەڕی بە پێغەمبەری موحەمەد نییە ، ئاخر چۆن بابای موحەمەدی کچی خۆی بداتە کوڕێك کە باوەڕی بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەی ئەو نییە!!

مهندس ڕەفاعی باوەڕی وایە کە لەو ئایەتانەی باسی ما ملكت ئیمانکم –مولکی یەمین لەو سوڕەتانە دەکەن ، مەبەست لێی ئافرەتی ئیمانداری ئەهلی کتابیە ."

١. ئەوەی لە بەر دەستکورتی نەیتوانی ژنی ئازادی موسڵمان بێنێت ، با ماملكت ئیمانکمی ئیماندار بێنن ، لە خاوەنەکانیان بخوازن هەروەها مارەییان پێبدەن ..."

٢. ئایەتی ٣ی نیساء و ٦ی مؤمنون

٣. ئایەتی ٣٦ی نیساء و ٧١ نەحل

هاوسەرگیریەکەی مولکی یەمین وەك هاوسەرگیری ئازاد بووە ، دەبێ لە ئەهلی داوابکرێ و مارەیی بدرێت :

مولکی یەمین لەم ئایەتانە کیتابی ئیمانداره و لە ئەهلی داوادەکرێ و مارەییشی دەدرێتێ .لەمەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو دیاردەی چیانەیەتی تەبەقی و کۆمەلایەتیەی لە شارستانی هیندی و جاهیلی عەرەبی هەبوو ، قورئان بە جیاوازیەکی ئیمانی گۆڕی ، بە واتای قورئان جیاوازی تەبەقی کالکردەوە و جیاوازی ئیمانی لە نێوان ئافرەتی موسلمان و ئافرەتی ئەهلی کیتاب لە جولەکە و نەصرانی و زەردەشتی زیندوو کردەوە . ئافرەتی موسڵمانی لە کۆمەڵگەی ئیسلامی بە ئافرەتی ئازاد دانا کەچی ئافرەتی ئەو دینانەی بە پلەیەکی نزمتر دانا !

ئەو پلە نزمیە ، بە گوێرەی کار و بەردەستی ...، مافی زیاتری لە ئافرەتی ئازاد و هەبوو هەبووە : ئافرەتی ئازاد زینای بکردایە وەك هەموو ئافرەتێك ئازاد تەواوی ١٠٠ جەڵدەی خۆی وەردەگرت ، بەلام مولکویەمینێکی کچ ئەو کارەی بکردایە نیوەی جەلدە ، ٥٠ جەڵدەی ئاشکرای بەر دەکەوت-نیسا٢٥ . بە واتای گەر کچی دەوڵەمەند و ئازاد شکۆ و چینی هەبوو لە هەمان کاتیش بەرانبەر زینا سزای تەواوی هەبوو ، مولکی یەمین کارکەر بوو ، بەلام بەرانبەر ئەو ڕەوشە سزای نیوە بوو .

## دووەم ، سێوی یا منداڵی نابالغ

وەك گوتمان لە کۆمەڵگا منداڵێکی کچ و کوڕی نابالغ بە هۆی جیابوونەوەی دایك و باوك و هۆکاری تر دروست دەبن . ئەو منداڵە نێرینانە لە حوکمڕانی شیوعیەتدا دەکرانە لەشکری سوور هەروەها مێینەکانیش بە زۆری دەبوونە موڵکی دەوڵەت و مەشاعەتیەکیان بە سەر فەرز دەکرا ، نەوال سەعداوی ئەوانەی بە سۆزانی ناو نەدەبرد چونکە خۆشیان لە پێناوی ئایدیۆلۆژیا نەك پارە بە پیاوی شیوعی دەبەخشی.

ئەو منداڵە نێر و مێیانە لە ماڵی موسڵمانی هەبوو دەژیان ، ئافرەتی ئازاد بۆی هەبوو لە حزوری ئەوانە ڕەفتە نەبەستێت ، وەك

١. ئایەتی ٣١ نور ( یەتیمی نابالغ )
٢. ئایەتی ٥٥ی الاحزاب

کەواتە واتای دووەمی موڵکی یەمین لە قورئان دا بریتییە لە یەتیم و سێوی نابالق ، ماڵ و مناڵ ، ژێر ڕەعیەت و سەرپەرشتاری.

واتای سێیەم ، واتای ئابووری کە هیچ پەیوەندی بە سێکس ەوە نییە

واتای دی موڵکی یەمین بریتیە لە " سەپان " و " ڕەعیەت " ، ئەو دوو ئایەتەی سوڕەتی نەحل -٧١ و ئەلرۆم -٢٨ بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە هاوسەرگیرییەوە نییە . بۆ نموونە هەژار موکریانی لە ل٢٧٤ لە تەرجوومەی سیمانتیکی ئایەتی ٧١ ی سوڕەتی نەحل دەڵێت : " خودا ڕۆزی هێندێکتانی لە هێندێکان پتر داوە . ئەوی پتریان پێدراوە ، بەشی ژێردەستانی خۆیان نادەنەوە ، کە لەوەشدا وەکو یەکن. ئاخۆ ئێوە لە بەهرەی خوا حاشا دەکەن؟ ." قەهاری شێخ لە ل١٦٥ی کتێبی بە زمانی حاڵ ، دەنووسێت :" ئەو دوو ئایاتەی سەرە قسە لە سەر کەسابەت و

کاروبــاری ئیقتصــادی بــە هاوکــاری مولکــە یەمینــەکان دەکــەن و هــیچ پەیوەندیشی بە زەواج و خێزانداریيەوە نییە ."

ئێستا لە دنیای مۆدرنی کوردی باشوور دیاردەی تاکی بەنگەلادیشی هەیە لە ماڵی کوردی خواپێداو هەمان دیاردە ساڵانێکە لە کەنداو هەیـە ، بـە تایبــەتی لــە ســعودیا کــە بەنگالیــەکان زۆربــەی مــۆڵ و ســوپەرمارکێت و هایپەرمارکێت و دوکانەکان بەڕێوە دەبەن .

## کۆنتێکستی مولکی یەمینی ( ژن ) لە قورئان

قورئان دەقێکی گەردوونیـە ، نـەك لۆکـەلی . ئـەم دەقـە بوونەوەرییـە قسـە لـە سـەر پرسـەکان بـە دیـدێکی ئاسمـانی بـۆ زەمـین نشـینان دەکـات ، کەواتــە خــودی تارمــایی تــوراس لــە ســەر دەقــی قورئــان پرۆســەیەکی مرۆکردەیە ، نەك خوداکردە .

مـولکی یـەمین مـرۆڤن لەوانەیـە ئیمـانی مـولکی یـەمینێك لەگـەڵ ئیمانی ئاغا و خانمێك جیاوازی هەبێت ، ڕۆژی قیامـەت هـەموو یەکسانین ، بێ نەسەب و لەقەبین ...ئەوەی براومیە موتەقی بێ فیز و دەعیەیە !

## مولکی یەمین لە نێوان مێی و نێریی لە قورئاندا

لە قورئانی پیرۆزدا ما ملکت-مولکی یەمین بە هەردوو شێوە هاتووە : مێیە ، نێرە هەروەها ژن و پیاوی ئازاد مولکی یەمینی نێر و مێیان هەیە ، کەواتە جیاوازیەکی جێندەری لە پرسەکەدا نییە . هەر چوار تەفسیری کوردی : نامی ، ل ٣٥٣ ، ئاسان ، ٣٥٣ ، پوختە ، ل٣٥٣ ، ڕامان ، ل٥٨٠ ما ملکت ی ئەم ئایەتەیان بە بەندە و کەنیزە داناوە ، کەچی هەژار موکریانی ، ل٣٥٣ بە نێری خولامی تەرجوومەکردووە !

(وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن ولا يبدين زينتهن إلا ما ظهر منها وليضربن بخمرهن على جيوبهن ولا يبدين زينتهن إلا لبعولتهن أو آبائهن أو آباء بعولتهن أو أبنائهن أو أبناء بعولتهن أو إخوانهن أو بني إخوانهن أو بني أخواتهن أو نسائهن أو <u>ما ملكت أيمانهن</u> أو التابعين غير أولي الإربة من الرجال أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء ولا يضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن وتوبوا إلى الله جميعا أيه المؤمنون لعلكم تفلحون) النور - الآية ٣١

کەچی هەمان ئایەت لای مهندس ڕەفاعی مولکی یەمین بە کەسانی ناو کۆشك : ئەوانەی پەککەوتەن یا مندالْن نەگەیشتوونەتە تەمەنی بالْقبوون دادەنێت ، وەك دەلێت : " ما ملكت أيمانهن = لذين يقعون تحت وصيتهن و رعايتهن واشرافهن الذين ليس لديهم شهوة و غريزة و ميل للنساء كل اطفال دون سن الاحتلام مثال :اليتامى ."

کورتەی قسان ئەوەیە ما ملکت بە شێوەی مێ و نێر هەیە هەروەها هەیە لە تەمەنی زەواجە یان تەمەنی یەتیمە –منالە ، هەشە پەککەوتەیە . منداڵی نابالغ ( کچ یا کوڕ ) ، سەپان و سەرکار و پەککەوتە هیچ پەیوەندیان بە زەواج و ڕابواردنەوە نییە ، ئەوانەی پەیوەندی ئاشکرا و نهێنیان هەیە لای قورئان ئافرەتی مەرغوب نیین کە ببنە هاوسەر و دایکی مرۆی موسڵمان .

جۆرە ئافرەتانێك هەن شایەنی ئەوە نیین ، ببنە هاوبەشێکی خێزانی ، چونکە ڕەمزی دابەزینی کۆمەڵایەتین بۆ پیاو ! شەڕە ماڵوێرانەکانی صەدام و بەشار ئەسەد ، ئافرەتانێکی گەنجی ناچارکرد لە ترافیك لایتەکان دەرۆزە-سواڵ بکەن ، زۆربەی هەرمزۆریشی خۆداپۆشن ... ئایا هیچ پیاوێکی خاوەن مەنزڵی کۆمەڵایەتی ئامادەیە ئەو جۆرە کچانە بخوازێت ؟؟! هەروەها کچی دی وەك قەرەج و قەپقاسی هەن ، ئەوانیش کچی کۆمەڵگەی داخراون ، دەرفەتی ئەوەیان نییە شوو بە کوڕێکی کۆمەڵگەی شار و مەدەنی بکەن ، بۆیە ناچارن شوو بە کوڕی کۆمەڵگەی داخراوی خۆیان بکەن!!

ئایا فێمینیستی کوردی ڕۆژەك دەرگای لەو توێژە کردۆتەوە؟ ئەوانیش مرۆ نیین؟ هەبوونی ئەو توێژە ( مولکی یەمین )ی مۆدرن لە کۆشك و کۆڵان و ترافیك لایت ...مێژوویێکی کۆنی هەیە ، ئەو ( ڕەوشە ئابووریەی ئەوان) دوورو نزیك پەیوەندی بەجاریە و کۆیلەبوونەوە نییە.

لە لایەکی دی هەبوونی مولکی یەمینی مێ بۆ مێ هەروەها مولکی یەمینی نێر بۆ نێر بانگاشەی فێمینیزم تەواو بەتاڵ دەکاتەوە ، گەر مولکی یەمین پەیوەندی بە سێکسەوە هەبووایە ئەوا پرۆسەی لیسبیەن و

هۆمۆسێکچوەڵ لە قورئان دروست دەبوو ، لە سەر ئەو بنەمایەوە بانگەشەکەی فێمینیزم تەواو نا ـئەرگومێنتیە ، چونکە ئیسلام شەڕێکی نەبڕاوە دەگەڵ ئەو دوو پرۆسەیە دەکات .

با فێمینستی کوردی چاك بزانێت لە قورئاندا شتێك نییە بە ناوی جاریە یا کۆیلە ، بەڵکو ئەوە توراسی عەرەبیە لە پاش وەفاتی پێغەمبەر بەرگێکی شەرعی داوەتە جاریەی کۆن ، مالکتی ئاوا تەرجومە کردووە ، ئەگەرنا لە زەمەنی پێغەمبەر ئیسلام لە نیوەدورگەی عەرەبی تێپەڕی نەکرد هەتا ئەسیری ئافرەت هەبێت ، لەگەڵ مردنی پێغەمبەریش قورئان تەواو بوو ، کەواتە ئەوە توراسە ئەم شرۆڤەیەی بۆ ما ملکت دانا .

دنیای لیبرال و دیموکراسی و کۆمۆنیستی دوور لە ئایین ڕەوشێکی ئەوهای بۆ ئافرەت دروستکردووە کە لە پێناو ئایدیۆلۆژیا و لەزەتی سێکسی و پارە بۆتە کالآیەکی بێ نرخی پیاو ! لە بەشی کۆتایی ئاماژە بەوە دەکەین کە دکتۆر نەوال سەعداوی سۆزانیەکانی ژێر حوکمڕانی کۆمۆنیستی بە سۆزانی ( لەشفرۆش ) ناونەدەبرد چونکە ئەو جووتبوونەی بە لەزەتی ئایدیۆلۆژی ناودەبرد بە بەهانەی ئەوەی بەرانبەر بەو کارەش پارەیان وەرنەدەگرت!!

## مولکی یەمین –کەنیزەك لە نێوان قورئان و توراس دا

توراسی عەرەبی جاهیلی توراسی هەبوونی جاریە و کۆیلە و تالآنکردن بوو ، بۆیە هەولدراوە لە لایەن عەقڵی عەرەبی و عەقڵی کوردی ئەو دووە لە سەر بنەمای جیاواز بە دەقی قورئان ببەستنەوە. بالی سیکیولەری عەرەبی بالێکی ناسیونالیە ، بەردەوامی و مانەوەی خۆی بە پاڵپشتی نیفاقی و ڕواڵەتی قورئانی دەبەستێتەوە . ئیسماعیل بێشکچی ناهەقی نەبوو ئەو تەرزە عەلمانیە بە شەپۆلێکی ئیستعماری دەبەستەوە ، کەواتە ئەو سێکوچکەی جاریە+کۆیلە +تالآنکردن بە مافێکی توراسی عەرەب دادەنێت لە بەرانبەر نەتەوەی هاوتخووبی وەك کورد!

لەولاوەش ناسیوناليستی بە تامی چەپی ئەو سێکوچکەیە بە کاردێنێ بە نیازی دوورخستنەوەی کورد لە قورئان .

تەفسیری کەنیزەك لە قورئان یا توراس لە کۆمەڵگای کوردی؟؟

بۆ نموونە کەنیزەك لە بەشێك لە تەفسیرەکانی کوردی

وەك گوتمان کەنیزەك و جاریە سینینۆمی یەکتر نیین تەواو هەڤدژی یەکترن ، کەنیزەك بەرهەمی دەستکورتییە ، بۆیە چۆن ئێستا کچی گەنجی بەنگەلادیشی و ئەسیوپی و ڤێتنامی...لە مالآن کار دەکەن ، کەنیزەك – مولکی یەمینیش بە خۆهێشتی خۆی لە بەر باری ئابووری لای مالی فلان کارەکەر بوو .

لە کۆمەڵگای کوردی کەنیزەك بە جاریە چواندراوە، ئەوەش دوور نییە لە توراسی عەرەبی وەرگیرابێت ، چونکە پێش هاتنی ئیسلام کۆمەڵگای عەرەبی پڕ بوو لە جاریە و حەرەمسەرا و سۆزانی . هەر لە سەر ئەو بنیاتە کەنیزەك-مولکی یەمین بە جاریە و ئەسیری شەڕ و سەبایا بەستراوەتەوە ،

ئەگەرنا بە دەقی قورئان هەردووک تەواو لە یەک جودان. لە ئیسلامدا کەنیزەک زانایە و چەندەها پیاوی گەورە لە ژێر دەستی دەخوێنن وەک نموونەکەی عەبدلەقسوود لە ل٩٨ی کتێبی ژن لە ئایین و چاخە جیاوازەکاندا هەروەها لە ل٩٦ فەرموودەیەکی پێغەمبەر لە گێڕانەوەی بوخاری و موسلم دەهێنێتەوە کە هەرچی کەنیزەکێک بخوازێت ئازادی دەکا لە دەستکورتی و وەک ژنی ئازاد بە مارەیی دەیهێنێتە ناو کۆمەڵگا .

ئەو تێگەیشتنە هەڵە و توراس ئامێزە بۆتە دین بۆیە زۆربەی ڕاڤەکاری کورد ئەو توراسەی ڕاڤەکردووە ، نەک خودی دەقی قورئان و کۆنتێکستەکەی .

عەزیز عارف لە کتێبی ( نماذج من الخلل في ترجمة القرأن الكريم- بالأنكليزية و الفرنسية ) باسی چەند هەڵەیەکی زمانەوانی و هزری قورئان دەکات لە ڕۆژئاوا ، ئەو هەڵانە زۆری بە ئەنقەست بووە ، بەلام هەڵەی کوردی هەڵەی هەڵە حاڵیبوونە ، چونکە ئەو توراسی وەرگێڕاوە نەک دەقی ئیلاهی .

کەلتوور و مێژوو و ڕاڤەی هەڵە بۆ قورئان ، ئیسلامێکی داعشی لە زەینی تاک دروست کردووە. لەم شرۆڤەیەدا تەنها ئاماژە بە شەش تەفسیری قورئان بە کوردی دەکەین :

١. تەفسیری نامی
٢. تەفسیری ئاسان
٣. پوختەی تەفسیری قورئان
٤. تەفسیری گوڵشەن
٥. تەفسیری هەژار موکریانی
٦. تەفسیری ڕامان

ڕۆشنبیری ئیسلامی کوردی باشوور لە سەدا نۆوەتی زیاتر لە سەر تێگەیشتنی عەرەبی لە قورئان دامەزراوە . کۆمەڵگای عەرەبی دوورگەی عەرەبی جمەی دەهات لە دیاردەی هەبوونی جاریە ، فلیمە مێژوویەکانی سەردەمانی بلاوکردنەوەی پەیامی ئیسلام پڕیەتی لە دیاردەی جاریە لە کۆمەڵگای عەرەبی هەروەها وەك قورئان پێمان دەڵێت کۆمەڵگەی عەرەبی بەدەر نەبووە لە زەواجی ناشەرعی وەك کۆکردنەوەی دوو خوشك ، زەواجی پلك ، زەواجی دایکی ژن ناسراو بە خەسوو، بۆ نموونە مبارکفوری لە ل٤٤ گولاوی سەرمۆر دەڵێت : " لە جاهیلیەتدا فرەژنی سنووری نەبوو ، دوو خوشکیان پێکەوە دەخواست ، باوەژنی خۆیان دەخواست کاتێك باوکی تەلاقی بدایە یا بمردایە" صەلابی لە ل٤٥ هەمان شت دووبارە دەکاتەوە.

چۆن لە هیندۆسی چینەکانی کۆمەڵگا چوار چین هەبوو وەك بەراهیمە ، شەترا ، ویش ، شۆدەر-شودرا –گۆستاڤ لوبۆن ،ل٢٩٥ ، صەلابی ل٢٤ هەروەها ئێستاش هەمان سیستەمی تەبەقات هەیە لە ئێزیدی –کوردی ، لە کۆمەڵگای عەرەبی جاهیلیش ئافرەتی خانەدان و ئازاد هەبوو لەگەڵ ئافرەتی نزمتر . مبارکفوری لە ل٤٣ دا دەنووسێت کە لە ناو ئەشرافدا ژنی ئازادی و ئیرادەیەکی سەربەخۆی هەبوو ، صەلابیش لە ل٤٨دا دەنووسێت ئافرەتی عەرەبی ئازادیش تەنها بۆ مێردەکەی هیچ کەسێك بۆی نەبوو پێوەی ڕابوێرێ...عائیشەی دایکمان پێمان دەڵێت کە چوار شێوە بوو :

١. یەکیان بەو شێوەیە بوو ، کەئێستا هەیە

٢. سەرجێیی کردن : پیاوەکەی ژنەکە پێی دەڵێ کە پاش عادە لەگەڵ فلانە پیاو بنوو ، تا وەجاغزادەیەکیان لەو پیاوە هەبێت ، (لە خوارەوەی شەستەکان ئەو دیاردە قێزەونە لە ناو هەندێ تیرەی کورد هەبووە!!)

٣. دە پیاو کەمتر سێکسیان لەگەڵ ژنێك دەکرد ، پاش هەبوونی زگ خۆی بە سەر پیاوێك ساخدەکردەوە!

٤. سۆزانی ، ماڵەکەی بەوە دەناسراوەوە کە ئاڵایەکی سووری هەڵدابوو!

هەبوونی کەنیزەك –جاریە دیاردەیەکی بەربڵاو بوو لە سەردەمی جاهیلی عەرەبیدا ، کە جارێك پیاوێك بە پێغەمبەری گووت فلان منداڵ لە فلان ژن منداڵی منە ...پێغەمبەر فەرمووی : " کاروباری جاهیلیەت بە سەر چوو ."- مبارکفوری ٤٥ . صەلابی لە ل٤٩ باسی سێ جۆری هاوسەرگیری هەبوو :

١. نکاح المتعە نێستاش لای شیعە هەیە ، هەرتەلی لە ل ٤٧٤ دەڵێت ئەو ژنهێنانە حەرامە

٢. نکاح البدل – ژن گۆڕینەوە

٣. نکاح الشغار – ژن بە ژنی بێ مارەیی هەتا هەشتاکان لای کوردی لادێ مابوو

هەبوونی کۆمەڵگایەکی تەبەقی ، ژنی ئازادی لەو کارە قێزونانە دوور بوو ، ئیسلامیش ئەو باوەوەی تەواو لە ناو برد ، جگە لە هاوسەرگیری یەکەم ئەوانی دی هەموو بە زینا دانا بۆ ئەو کارە بەدڕوشتیە سێ سزای دانا :

١. لە ژوورەوە حەپس کردن

٢. ترساندنی وشەیی

٣. جەڵدە

له ل٥٣ صەلابی قسەیەکی هیندی هاوسەری ئەبو سوفیان له سیرەی نەبەوی ئەبی شەهبه دەگوازێتەوە ، کە پێغەمبەر دوای ئازادکردنی مەککە گوتویەتی ئەی خەڵکینە داوێن پیسی نەکەن ، هیندیش وتویەتی ژنی ئازاد چۆن داوێن پیسی دەکات ؟ لەو وەڵامە دەفامرێتەوە کە بە دەگمەن ئافرەتی ئازاد زینای کردووە هەروەها ڕووداوی ئیفك لە سورەی نور باشترین بەڵگەیە کە زیناکردن بۆ کەنیزەك و سۆزانی ئاسایی بووە چونکە هەر ئالآیان هەبوو ، بەڵام بۆ ژنی ئازاد تەواو شەرم و حەیاچووبوون بوو .

لەو کورتە مێژووەدا ناوی ملکت ئەیمانکم وەك وەك کەنیزەك نایەت ، بەڵکو وشەی جیاواز بۆ ما ملکت ئەیمانك و جاریە هەاتووە ئەوەتە لە ل ٩٠ فەرهەنگی ئەلمونجیدی عەرەبی –کوردی هاتووە : " امی –الجاریە بە واتای کەنیزەکەکەی کرد بە کۆیلە ."

ئەوەی لە کەلتوور و توراسی عەرەبی هەیە دەربارەی ئیسلام هەمان شێواز و دیتن لای کورد هەیە . ئەو هەموو ژینامەی پێغەمبەر بە زمانی عەرەبی هەیە ، هەر هەمان شێواز لای کوردیش هەیە وەك بڵێی ژینامەی پێغەمبەر هەموو جەنگ و شەڕ و شۆڕ بووە ، زۆر کەم باس لە ڕەهەندە مرۆیی و عەقیدەیی ئیسلام کراوە . گەورەیی دەقی قورئان لەوەدایە ، کە گۆڕانێکی بنەڕەتی ژیانی گەلان کرد لەوانە عەرەب ، کە پێغەمبەر دەربارەیان دەفەرمووێ ئومەتێکی نە خوێنەوار و نەزان لە نووسین و حیسابدا ، قورئان توانی میللەتێکی بتپەرستی ئاوا بکاتە میللەتێکی شارستانی دروستکەر ، بۆیە زۆر گرینگە ژیانامەیەك بە پێوەری قورئان و سیرە بنووسرێ تەنیا جەخت لە سەر لایەنە مرۆییەکان بکرێت ، نەك گێڕانەوەی بەرئاگردان ، چونکە ئەو دیتن و شرۆڤەکردنە فەلسەفە بە دەقی قورئان دەدا ، گێڕانەوەکەش تەمبەڵی و ئەفسانە!

## دوو نموونەی سوڕەتی مەکەیی و مەدینەیی

## دەربارەی کەنیزەك لە هەندێ تەفسیری کوردیدا

لەو دوو بەراوردیەدا مولکی یەمین لە ئەلمۆمنونی مەکەیی و نیسای مەدینەیی دەکەین . ئەوەی شارەزای مێژووی بەرایی موسڵمانان بێت ، چاك دەزانێت ڕەوشی موسڵمان لە ١٢ ساڵی بەرایدا لە مەککە چۆن بووە؟ سورەتی مۆمنون باسی زەواجی ناچاری دەکات کە بریتی لە ژنهێنان لە چینی هەرە خوارێ ی کۆمەڵگا _ هێنانی ژنی کارەکەر و بێ شوناسی خانەدانی کۆمەڵگا ئێستاش پەسند نییە .

بابزانین تەفسیرەکانی کوردی چۆن لەو پرسە گەیشتوون :

١. تەفسیری نامی—ئایەتی ٦ لە سورەتی مۆمنون ل٣٤٢ :

" تەنها بۆ هاوسەری شەرعیی خۆیان یان کەنیزەکیان نەبێ کە بە گوێرەی شەرع بووبن بە هی ئەوان..."

٢. تەفسیری ئاسان ، ل٣٤٢

" جگە لە هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت..."

٣. تەفسیری گوڵشەن ، ل٧٢٦

" بەڵام ئەو کەسانەی کە دەچنە لای هاوسەرەکانی خۆیان و ئافرەتە کۆیلەکانیان و لەگەڵیان جووت دەبن...."

٤. پوختەی تەفسیری قورئان ،ل٣٤٢

" مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یا بۆ کەنیزەکێك کە بووبن بە خاوەنیان ..."

٥. تەفسیری ڕامان لە مانا و مەبەستی قورئان ،ل٥٦١:

" مەگەر لەگەڵ هاوسەری خۆیان یان لەگەڵ کەنیزانیان ( ئەوانەی موڵکی خۆیانن "

پرسیار لێرە ئەوەیە ، چونکە سورەتەکە مەکیە ، ئایەتی چەند ژنی دانەبەزی بوو ،

أ. أو-ی قورئان بە واتای —و-ی کوردی لە ڕێی ڕێزمان و عورفەوە نایەت ، بەڵکو بە واتای -یان - دێت . بڕوانە تەفسیری ئاسان و گوڵشەن !!!

ب. کەنیزەك لە مەکە واتای کارەکەر یا دەستکورت ، ئیشکەری ماڵان دەدات ، موسڵمانی سەردەمی مەکەش جگە لە چەند موسڵمانێکی وەك ئەبو بەکر و عومەر وعوسمان و...نەبێت هەموو ڕەش و ڕووتی کۆمەڵگا بوون ، بۆیە گەر نەیتوانیبا ژنی ئازاد بینن ، دەیانتوانی موڵکی یەمین —کەنیزەك ( کارەکەری ماڵی خۆیان بینن ) .

ت. زۆربەی تەفسیرە کوردیەکان هەڵگری گومانێکن لە گوزارشتکردندا ، تەفسیری گوڵشەن موڵکی یەمین بە کۆیلە تەفسیر دەکا ،، پوختە بە کەنیزەکێك بووبن بە خاوەنیان ، یا تەفسیری ڕامان...ئەوانەی موڵکی خۆیانن !!

هەندێ لە تەفسیرەکانی عەرەبی دەربارەی ما ملکت ئیمانکم شتی وا نووسراوە مرۆ شەرمی لێدەکات لەوانە لە ل٤٤٦ ی زبدە التفسیر ...الاشقر لە بارەی ئایەتی ٦ سورەتی مؤمنون هاتووە : " ما ملکت ایمانهم ( من الاماء ملکا خالصا اي فیحل لهم التسري بهن مالم یمنع ذلک مانع

شرعي ، كأن تكون اخته من الرضاعة.". التسری لە ئینگلیزی بە واتای concubinage یا concubine دێت.

ئەم وشەیەش لە ل٢٠١ فەرهەنگی ئازادی ئەوها تەرجومە كراوە :" ژیانی پیاوێك و دۆستەكەی پێكەوە بە بێ مارەكردن –باری ژیانی دۆست " لە ئەشقەر دەپرسم موسڵمانی مەككە لەبەر جەبەڕوتی دەسەڵاتی جاهیلی عەرەبی شوێن نەبوو خۆی لێ حەشار بدات هەروەها هەر لە سەر ئیمانەكەی توندترین سزا دەدرا ، ئاوارەی حەبەشە و مەدینە دەكرا ، دەرفەتی ئەوەی هەیە لەگەڵ دۆستەكەی ڕابورێت ! جەناب ئایەتەكە قسە لە سەر موسڵمانی سەرفیراز لە دنیا و قیامەت دەكات ، جا چۆن دەچێ لەگەڵ ژنێك ڕادەبوێرێ بەبێ هاوسەرگیری؟؟! ئایەتەكان وەك دەقێكی ئیلاهی باس لە هەبوونی مارەیی لە هاوكێشەكە دەكەن!

ئەو لێكدانەوەی ئەشقەر تەواو لە مولكی یەمینی مەدینە دەبینرێت !

تەفسیری مولكی یەمینی مەدینە

لە مەدینەدا ئایەتی چەند ژنی دابەزی ، ژنی ئیمانداری جوو و نەصرانی لە كۆمەڵگای مەدینە هەبوو ، بە حوكمی ئەوەی مولكی یەمین – كەنیزەك لە كۆمەڵگا بێ سەرپەرشت و بە سەرپەرشت و بێ دۆست و بە دۆست هەبوون ، خودا لە مەدینە موسڵمانی دەستكورتی سەرپشك كرد كە دەتوانی كچی جوو و مەسیحی دیندار و مولكی یەمینی بە سەرپەرشت و بێ دۆست لە خزم و كەس داوا بكات و مارەیی بدات هەتا ئەو كچ و ژنانە لەو ڕەوشە كۆمەڵایەتیە ڕزگار بكات و دوو خەڵاتی ئیلاهی بۆ خۆی مسۆگەر بكات .

لە لایەکی دی دابەزینی قورئان پەیوەست بوو بە تەمەنی پێغەمبەر هەرکە ئەو وەفاتی کرد ، بەرنامەی کەلامی خودا بۆ مرۆڤەکان تەواو بوو . پێغەمبەریش لەو ١١ ساڵەی حوکمڕانی نە جاریەی بە شێوەی ئاشکرا لە کۆمەڵگا هێشت وە نە هیچ ئەسیرێکی ئافرەتی هەبوو . کەواتە لە مەدینە مولکی یەمین بریتی بوو ئیمانداری جوو ، نەصرانی ، کارەکەر ، منداڵی نابالغ لە کچ و کوڕ ، پیاو و ژنی پەککەوتەی ئارەزووی سێکس نەماو .

لەم شرۆڤەکردنەدا جەخت لە سەر تەفسیری ئایەتی ( ٣ ) و ( ٢٤ ) سورەتی ئەلنیساء دەکەم ، کە سورەتێکی مەدینەییە :

١. تەفسیری نامی

"ئەگەر ترسان لەوەی لە نێوان ئەم ژنانەتاندا عەدالەت نەکەن ئەوا هەریەك ژن بهێنن ، یا لەگەڵ ژنە جاریەی کڕاوتان دا ڕابوێرن ...ل٧٧

ئەو ژنانەی شوویان هەیە و بە نیکاح پارێزراون لە ئێوە حەرامن ، بەڵام ئەو ژنە شوودارانەی لە جەنگدا دەستتان ئەکەون و بەدیل ئەگیرێن و مێردەکانیان کافرن ، ئەوانە حەڵاڵ بۆتان-ل٨٢"لە تەرجومەی ئایەتی ٢٥ی هەمان سورەت " ئافرەتە مەملووکە موسلمانەکان"

کەواتە لای عەبدولکەریمی مودەریس : ما ملکت ئیمانکم بریتیە لە جاریەی کڕاو و دیلی جەنگ !

٢. قورئانی پیرۆز بە ترجمەی هەژار موکریانی

"ئەگەر ترسان کە نەتوانن ژنەکانتان وەکو یەك تماشا بکەن ، با یەکێك بێ یان وەل ئەوانە رابوێرن کە بوونەتە موڵکی خۆتان—ل٧٧ "

" ژنی بەشووتان پێ ناشێ ، مەگین ئەوانەی بوونەتە ماڵی خۆتان—ل٨٢ "

لای هەژاریش ما ملکت ئیمانکم بۆتە ئەوانەی موڵکی خۆتان یا ماڵی خۆتان ، بەڵام هەر لە تەرجومەی ئایەتی ٢٥ دا دەردەکەوێ ئەو کەسانە " با لەو کیژە باوەڕدارانە بوونەتە ماڵی خۆتان " نن!

٣. تەفسیری ئاسان

" خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کە نەتوانن دادوەر بن ( لە نێوان هاوسەرەکانتدا ) ئەوە با یەك ژن مارە بکەن ، یان ئەو کەنیزەکانەی کە هەتان ( کە دیاردەیەکی کاتی بوو ، ئیسلام بنەبڕی کرد )ل٧٧

" هەروەها حەرامە لێتان ئەو ئافرەتانەی کە مێردیان هەیە جگە لە کەنیزەکتان ( لەو زەمانەدا باوبووە ) ئەویش لە تەرجومەی ئایەتی ٢٥ دەنووسێت : ئەوەش کە نەیتوانی لە ئێوە لەبەر دەستکورتی ، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدار مارەبکات ، ئەوە با لە کچە کەنیزەکە ئیماندارەکانتان بخوازێت —ل٨٢"

بورهان موحەمەد ئەمین لە تەفسیرکردنی هەردوو ئایەتەکە دەقی ئایەتەکە بە مێژوو و کەلتووری عەرەبی دەبەستێتەوە .

٤. پوختەی تەفسیری قورئان

جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن یەك ئافرەت مارەبکەن لە ئازادان یان ئەو کەنیزەکانەی کە مولکتانن-ل٧٧"

هەروەها حەرام کراوە لێتان ئەوانەی مێردیان هەیە لە ئافرەتان جگە لەوانەی بوونەتە مولکتان –کەنیزەك- لە ئایەتی ٢٥ کەنیزەکە ئیماندارەکان ل٨٢.

٥. تەفسیری گوڵشەن

ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو کە نەتوانن بە عەداڵەتەوە لەگەڵیان بجولێنەوە...لەو کاتەدا نابێت لە ژنێك زیاتر ، بەلاَم دەتوانن لەو کەنیزەکانەی بە کۆیلایەتی دەکەونە بەردەستتان ، پەیوەندیتان هەبێت..."ل١٧٢

" بەلاَم ئەو ئافرەتانەی کە مێردیان هەیە و لە کاتی شەڕ لە دوژمنانی نا موسڵمان بەدیل گیراون و بوونەتە کۆیلە ، ئەوا دروستەبچنە لایان و تێکەلاَویان ببن! ل١٨٨"

٦. تەفسیری ڕامان

"...تەنها ژنێك مارە بکەن وە یا هەر بەو کەنیزانە دەستتان کەوتوون و بوونەتە مولکتان قەناعەت بکەن-ل١٤١ "

"ئەو ئافرەتانەیشتان پێناشێ مێردیان هەیە و ئازادن ، یا کەنیزەن ، مەگەر ئەو کەنیزانەی لە جەنگدا دەستتان کەوتوون و بوونە ماڵتان،ئەمانە گەرچی مێردشیان هەبێت حەلاَڵن بۆتان ....ل١٥١"

هەر ئەشقەر لە ل٩٧ دەربارەی ئایەتی ٣ی سورەتی نیسا دەنووسێت :

" او ما ملكت ايمانكم –من السراري و ان كثر عددهن والمراد نكاحهن بطريق الملك لا بطريق الزواج ، و لا حق للملوكات في القسم ."

گواستنەوەی ئەو ڕاڤە عەرەبیانە ، کە تەواو نامۆ و دوور لە ڕۆحی قورئانن هێندە بارگاوین بە کەلتوور و توراسی عەرەبیەوە هێندە گوزارشت لە قورئان ناکەن وەك دەقێکی ئیلاهی .

قورئان لە سورەتی الاحزاب ئایەتی ٦ بە ڕاشکاوی دەربارەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر دەڵێت : " و ازواجە امهاتهم ... هاوسەرەکانی پێغەمبەر دایکی ئیماندارانن " کەچی لە زۆربەی توراسی عەرەبیدا ناوی ماریەی قیپتی ، دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ، لە ڕیزی هاوسەرەکانی پێغەمبەر دانەنراوە!! هەمان توراس بێ زیاد و کەم گواستراوەتەوە نێو زۆربەی ئەو کتێبانەی لە سەر ژیانی پێغەمبەر بە کوردی نووسراون!

لە ئایەتی ٢٤ی نیسا کەنیزەکی ئیمانداری لە کەنیزەکی سەرشەقام جیا کردۆتەوە هەروەها خوا هەر لەو ئایەتەدا ( ٢٤ی نیسا )دوو مەرجی داناوە بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەنیزەکە ئیماندارانە :

١. داواکردن لە ئەهل-یان

٢. مارەییان بدەن

ئێ هەر هاوسەرگیریەك لە سەر ئەو دووە دادەمەزرێت .

له ل٩٨ی فەرهەنگی ئەلمونجید دەربارەی( اهل الامر) هاتووه كه به به واتای گەورەی –سەرداری كاروبار –سەرپەرشتیاری كاروبار هەروەها دەربارەی اهل هاتووه مارەكردن یا پیاوی خاوەن ژن و منداڵ " دوای داخوازی مامڵكت له ئەهل ، مارەیی دەژمێری چۆن بۆ ئافرەتی موسڵمان دەژمێری!

گەر وەرگرتنی تەفسیر له تەفسیری توراسی عەرەبی پاش پێغەمبەر نەبێت ئەو ڕاڤەكارانەی كورد ئایا دەقی قورئانیان وەك دەقێكی ئیلاهی دوور له هەژموونی توراس وەرگرتووه ؟یا تەرجوومەی توراسی عەرەبیان كردووه؟ له كوێندەری قورئان ئەسیری جەنگ كراوەته كۆیله و كەنیزەك؟!

هەروەها چۆن ئافرەتی چاك و بەرەلاّ له هەموو نەتەوەكان هەن ، له نێو كەنیزەكانیش هەیه ، كەنیزەیەك هەیه ئیمانداره یا كارەكەر بێت له ماڵێك هەروەها ئەو كەنیزەكه دەیان پیاو له ژێر دەستی خوێندوویانه ، كەنیزەكیش هەیه بێ سەرپەرشت و خۆی ئەهلی خۆ و جەستەی خۆی نییه ، ئەهلی سەرشەقامه خۆگری داپۆش نییه هەروەها به نهێنی زینا دەكات .

## ما ملكت و كۆیلە

هـەبوونی كۆیلـە لـە پـێش هـاتنی ئیسـلام لـە كۆمـەڵگا هـەبووە . بـۆ بنبڕكردنی ئەم دیاردەیە ، قورئان لە چەندان دەقدا كەفارەتی هەنـدێ گونـاھ و تاوانی بەستۆتەوە بە ئازادكردنی كۆیلە هەتا لە ماوەیەكی كەمدا كۆیلـە لـە كۆمـەڵگای ئیسـلامی نـەما ، چـونكە شوناسـی كۆیلـە لـە كۆمـەڵگای ئیسـلامی ببـووە سـەپان و بـۆدی گـارد هـەروەها مـافی ڕاگـرتنی كۆیلە نزیـك ببـۆوە لـە مرۆی ئازاد ، كە تەواو لـە چـەمكی كۆیلـە لـە ئـەوروپا جـودا بـوو ، بـەڵام لـە چەرخی تـازەدا ، جـۆرە كۆیلـەبوونێكی دی سـەریهەڵدا بـە نـاوی كۆیلـەبوونی ئابووری ( لە كۆتایی توێژینەوەكە قسەی لە سەر دەكەین ).

ما ملكت ئیمانك یا ئیمانكن لـە قورئـان دا جیـاوازن لـە كۆیلـە ، مـرۆی پارەدار دەسەڵاتی موتڵەقی لە سـەر بەنـدە هەیـە ، بـەڵام ئـەو دەسـەڵاتەی لـە سەر ما ملكت ئیمانك و ئیمـانكن نییـە . لـە قورئانـدا هەریەكـە وشـەی خـۆی بۆ بە كار هـاتووە : بەنـدە : رقبـە ، مـا ملكـت ئیمانـك –ئیمـانكن هەیـە ، بـۆ نموونە لە ئایەتی ۹۲ ی سورەتی ئەلنیسا ، لـە كـەفارەتی موسـڵمان كوشـتن بـە هەڵە و لە دەسـت دەرچـوون دوو مـەرج دانـراون : ۱. ئـازادكردنی بەندەیـەكی موسڵمان ۲. خوێنبایی بدات ...

لە لایـەكی دی مـا ملكـت-كـەنیزەكی ئیمانـدار چ جـوو ، نەصـرانی ، یـا ئافرەتی كەم دەرامەتی موسڵمان و پاك و دوور لە زینا (ئەهلی )خـۆی هەیـە دەتوانی داخوازی لە ئەهلەكەی بكەی و مارەیی بدەی ، بـەڵام بەنـدە خـاوەنی

خۆی هەیە ، بۆ نموونـە لـە سـەرەتا بیلالـی حەبەشی بەنـدەی ئومەیـە بـوو هەتا ئەبوبەکر کڕی و ئازادی کـرد، حەبەشـی بەنـدە بـوو ، سـلێمان فارسـیش بەندە بوو ، زەیدیش بە بەندەیی درابوو بـە خەدیجەی خێزانـی پێغەمبـەر ، پێغەمبـەر نـەك بـە بەنـدەی خـۆی دانـەدەنا بـەڵکو کردبوویـە کـوڕی خـۆی (هەتا خودا بە ئایەتێك منداڵی تەبەنیکراوی قەدەغـەکرد) . لـە یـازدە سـاڵی حـوکمڕانی خۆشەویسـت دا ، جاریـەکی ئاشـکرا و کۆیلەیـەك نـەبوو ، تـەنیا کەسی سەپان و شوان و خزمەتکار هەبوو ، وەك سەپانی مـاڵی فلانـی ، شـوان و گاوانی ماڵی فلانی ، خزمەتکاری ماڵی فلانی !

دکتۆر زەڵمی لە ل١٣ دەنووسێت : ئیسلام یاسای کۆیلایـەتی نـەهێناوە ، بـەڵکو ئیسـلام هـاتووە بـۆ ڕزگـارکردنی کۆیلـەکان لـە کۆیلایـەتی و زەلیلـی ، خودا لە ئایەتی ٧٠ی سورەتی الاسراء دوور لە شوناس و ئایدیۆلۆژیا ڕێـزی لـە مرۆڤ ناوە ." هەبوونی کرێکار —جوتیـار ( نێـر ) و کارەکـەر ( مـێ ) لـە نـاو کۆشـکدا واتـای کۆیلایـەتی ناگەیـەنێت ، بـەڵکو پەیوەنـدی ئاغـا و کرمـانج ، زەنگین و هەژار دەگەیەنێت .

ئەو دیاردەی دوایی لە گوندی کـوردیش هـەبوو : وەك گـاوانی ، شـوانی گونـدی ...، سەپانی ماڵی ئاغا ، شێخ ، کێخوا ، خزمـەتکاری مـاڵی ئێمـە... لـە یاسای حەمورابی و تەلمود نامووسـی ئـەو کەسانەی کۆشـك پـارێزراوە ، چـۆن قورئانی کەلامی ئیلاهی ڕێ بە نامووس بەزێنی مرۆڤەکان دەدات؟؟؟

لە کۆتایی ئەو دوو بەشە دەڵێم ، ئـافرەت لـە چـەندان ئایـەتـدا میراتـی وەك پیاوە ، لە چـەندان ئایـەتی دی لـە پیـاو زیـاتر وەردەگرێـت هـەروەها لـە

ئایەتی دی تەنها ئەو میرات دەبا ، پیاو نایبا ، دەزانی بۆ ؟ چونکە لە ئیسلامدا میرات لە سەر ڕەوش دامەزراوە ، نەك ڕەگەز .

ئەو ستەمەی لە کۆمەڵگای ستەمکاری هەیە ، پەیوەستە بە چینی کۆمەلآیەتی ، نەك ڕەگەزی مێ . چەندان بەڵگە لە کۆمەڵگای کوردی ئیسلامی و کوردی هەن ئەوە پشت ڕاست دەکەنەوە.

لە هەموو کۆمەڵگاکان زەنگین و بورژوا و وردە —بورژوا و پرۆلیتار و کەمدەرامەت هەیە. مولکی یەمین ، کە مێ و نێر و منداڵ و پەککەوتەی هەیە و موسڵمان و غەیرە موسڵمانی هەیە، دیاردەیەکی کۆئابووریە لە کۆمەڵگا ، ئەو کەمدەرامەتی و پرۆلیتاریە لای خودا ئەوها تێپەڕ نەبووە ، بەڵکو سزای کردۆتە نیوەی ئینسانی زەنگین و ئازاد و تاوانکار.

ئەو پرسە تەواو تێکەڵکراوە بە توراس بە جاریە ، کۆیلە ، ئەسیری جەنگ ، سەبایا ڕاڤەکراوە ، کە تەواو دوورن لە دەقی قورئان .

## دەروازەی بەشی کۆتایی

لەم بەشەدا بەر لەوەی باسی ئەوە بکەم ، کە سێکس لای زۆربەی ئەندامەکانی کۆمەڵگا تابوویە ، لای زاتی خودا پرسەکە ئەوها نییە ، بەڵکو ئەوەی لای خودا تابوویە سێکسی ئاشکرا و بەرەڵاییە! ئەگینا خودا لە سوڕەتی نیسا و سورەتی دی باسی سێکسی شەرعی کردووە هەروەها باسی زینا –سێکسکردنی ناشەرعیشی کردووە هەتا هۆمۆسێکچوەلی یا کردەی قەومی لووت و بەرەڵایی لە نێو کۆمەڵگا دروست نەبێت ...ئەوەی لە فیلم و مەلتی مێدیا ئەورووپی و ئەمریکی و دەوروبەر هەیە ، سێکسی ناشەرعیە . دەمەوێ ئەوە بڵێم جۆرێکە لە کەنیزەکی ئابووریی و جاریە و سۆزانی پێکەوە .

بەر لەوەی بێمە سەر دوا بابەت ، دەمەوێ ئاماژە بە دیاردەیەك بکەم ، کە پەیوەستە بە دیماگۆژی و پارادۆکسی فێمینیستی کوردی دەربارەی دیاردەکە .

لە دیدی قورئان هەموو بتپەرستیەك ، ستەمکاریە دەربارەی زاتی خودا . لە نێو توراسی نوێدا بتپەرستی عەرەبی بە (پاشکەوتن ، نەفامی )لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام بتپەرستی یۆنانی بە (پێشکەوتن ، هونەر ) دەزانن ! بە هەمان شێوەش لە سەردەمی ئایدیۆلۆژیدا فێمینستی وەك نەوال سەعداوی سۆزانی سۆفیەتی جاران بە ( سێکسی ئایدیۆلۆژی ) ناو دەبات ، کەچی سۆزانی غەرب و ڕۆژهەڵاتی ناوین بە بەرەڵایی ناودەبات ! لەم سەردەمەشدا سێکسی نا شەرعی ، نەك هەر بە ئازادی کەسیی لە قەڵەم دەدرێت ، بەڵکو بە هونەری ئیرۆتیکا و بوێری دەناسرێت .

جۆرەکانی سێکسی بەرەڵا لەم سەردەمەدا

١) توند و تیژی سێکسی

٢) سێکسی ئایدیۆلۆژیا

٣) سێکسی قوربانی ئایدیۆلۆژیا
٤) سێکسی ئابووری

## یەکەم ، توند و تیژی مەزهەبی و قەومی

توند و تیژی مەزهەبی و قەومی دەوڵەتی عیراقی کردۆتە دەوڵەتێکی مێژوو خوێناوی . گروپی موعتەزیلە و سەلەف وەك دوو گروپی دەسەلات و دەرەوەی دەسەلات تەواوی خەلافەتی گرتبۆوە . کێشەی موعتەزیلە لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هیچی کەمتر نەبوو لە کێشەی خەواریج و خەلافەت.

لە عیراقی نوێدا سەرەڕای توند و تیژی جەستەیی ، دوو جۆری توند و تیژی مەزهەبی و قەومی لە عیراقدا هەیە :

أ. توند و تیژی مەزهەبی و سێکس

عەرەبی بە ناو سوننە لە ١٩٢١ هەتا ٢٠٠٣ حوکمڕانی عیراقیان بە دەستەوە بوو ، بۆیە وێڕای توند و تیژی بەرانبەر مەزهەبی شیعی ، ئەوا هەردەم ئامادە بوو ئافرەتی شیعی وەك کەرەستەی شەرمەشکاندن بە کاردەهێنا .

کەنعان مەکییە٢٠٠٥ لە ل٣٥٩ -٣٧٥ی کتێبی دڵڕەقی و بێدەنگی ، لە ژێر سەردێری دڵڕەقی و ژنی عەرەب قسە لە سەر مەزهەبکاری و ناسیۆنالیزمی عەرەبی دەکات کە لە شەرمەشکاندن و هەتکردنی ژنی عێراقی ژمارەی پێوانەیی شکاندووە . بۆ ئەو شەرمەشکاندنەش فەرمانبەری موچەخۆری خۆی هەبوو : " عەزیز فەرمانبەرێکی مەدەنی بو، موچەی

مانگانــەی لــە ســەر هــەتکردنی ژنــی عراقــی پێــدەدرا ." کــردەی ئــەوها قێزەون کە بەرهەمی توراسی عەرەبیە لەگەڵ دەقی ئیلاهی ناگونجێت.

لە دوای هەرەسی ڕژێمی صەدام ، بە نـاوی گـرتنی ژن و کچـی سـوننەی معارەزە هەمان کردەوەی سێکسیان لەگەڵ ئەو ئافرەتانە کردووە .

ب. توند و تیژی قەومی و سێکسی

ئـەو حکومڕانیـە سـوننیەی پێشـوو بـە تایبـەتی لـە سـەردەمی صـەدام ۱۹۷۹-۲۰۰۳ دوو شۆڕشی گەورەی کوردی لە نێو برد ، ئەویش شۆڕشـی ئـەیلول ۱۹۶۱-۱۹۷۵ و شۆڕشی نوێ ۱۹۷۶-۱۹۸۹ بوون .

لە نێو زینـدانەکانی ئەو داگیرکەرە جگە لە تونـد و تیـژی جەسـتەیی و دەروونی پیاوەکان ، ئەوا تونـد و تیژیـەکی سێکسی بەرانبـەر ئـافرەتی کـورد بەکاردەهێنا . ئەمڕۆ داعش هـەمان تـاوانی شەرمەفشکاندن دەرهـەق ئـافرەتی کوردی ئێزیدی بەکاردەهێنێت!

## دووەم ، سێکسی ئایدیۆلۆژیا

لــە پــاش کودەتــای ئۆکتۆبــەری ۱۹۱۷ هــەتا ۱۹۹۰ چــەندەها دەوڵــەتی ئایدیۆلۆژیا بە تایبەتی ئایدیۆلۆژیا چەپی لە ئەوروپا و ئاسیا دروست بـوون . موحەمــەد یوســف حــەریری لــە نــەوال ســەعداوی دەگوازێتــەوە کــە ئــەو ئافرەتانــەی سێکســی مەشــاعی دەکــەن لــە ژێــر حــوکمڕانی ســۆڤیەت دا ، ئافرەتی سۆزانی نیین ، بەڵکو سێکسی ئایدیۆلۆژی و چێژی دەکەن ، کەواتـە ئەوان لە نەزەر سەعداوی لەشفرۆش نیین ، بەڵکو لەزەت بەخشن.

## سێیەم ، سێکسی قوربانی ئایدیۆلۆژیا

ئـەو ولاّتـە ئیشـتراکیانە ولاّتـی تـەواو داخـراو و پۆلیسـی بـوون .دوای هەرەسـی حـوکمڕانی شـیوعیەت دەرکـەوت ، کـە ئـابووری چـۆن چـنگی بـە ئینسانی هەڵچنی بـوو . سـۆزانیەت نـەك هـەر لـە ولاّتـی خۆیـان بـەرپا بـوو ، بەڵکو ئافرەتی ئەوروپای شەرقی ناچار بـوو تـەواوی مـەلهاکانی تورکیـا گـەرم بکات بە تایبەتی لە نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم.

## چوارەم ، سێکسی ئابووری ( دوایێ قسەی لە سەر دەکەم )

## تێڕوانینی نێرانە بۆ مێ

پرسی تێـڕوانینی نێرانـە مـێ لـە ڕواڵەتـدا بۆتـە پرسـێکی فێمینیزمـی جیهانی . پرسی فێمینیزم لە سەرەتای سەدەی بیستەوە لێـرە و لـەوێ پەیـدا بووە ، ئەویش بریتییە لە چاو تێبڕینی پیـاو ( نێـر ) لـە جەسـتەی ژن ( مـێ ) . شـیلان ڕەشـید ٢٠١٥ ، ل١٣٢ لـەم بارەیـەوە دەنووسـێت : " ڕوانـینی نێرانـە زاراوەیەکـە لـەناو فێمینیسـتەکان بـەکاردێت ، کاتێـك بـاس لـەوە دەکـەن کـە چـۆن پیـاو ، ژن دەکاتـە ئـۆبجێکتی سێکسـی ." لـەم هاوکێشـەیەدا پیـاو دەبێتـە " بینـەر " و ژن دەبێتـە " بینـراو " . ئـەو دیتنـە دایەلێکتیـە ، ئـەو دیتنـەش لای لاورا مـالڤی داهێنـەری زاراوەکـە ، دوو شوناسـی جێنـدەری جیاواز و مـەدلول جیاواز دروست دەکات ، پیاو دەبێتـە دروسـتکەری مانـا ، ژنانیش هەڵگری مانا.

## مێژووی ڕوانینی نێرانە بۆ مێ

هەرچەندە لە نەزەر شیلان ڕەشید ، ل١٣٣ ئەو ڕوانینە دەبەستێتەوە بە وتارێکی لاورا مالفی " چێژی بینراو و گێرانەوەیی سینەمایی ـ١٩٧٥ " ، بەلاّم بە ڕای من ئەو دیاردەیە بەشێك لە شوناسی تۆماس هاردی و بەشێکی شاراوەی هەشتی مارسی ئەمریکای پێکدەهێنا . لەو هەمووەدا ڕوانینی نێرانە ئامادەگی هەیە سیمۆن دۆ بۆڤواری ژنی ناو مەجلیسی نوسەرانی وەك جۆن پۆل سارتەر و ئەلبێرت کامۆ ... کۆمەلگا بۆ کۆمەلگایەکی پیاوسالاری ، لەو جۆرە کۆمەلگا پیاوسالاریە ژنان بە ئەوانی دیکە ، یان بە ئەوانەی نێر نین ناسراون-شیلان ١٣٤ . لە کۆمەلگای ڕۆژهەلاّتی ناوین ، فێمینیستی عەرەبی ئەو ڕوانینە بە قەدەری ژنبوون و شوناسی خالّقی نێر و مێ دەبەستێتەوە . دکتۆرە نەوال سەعداوی لە کتێبە توبی و ڕۆمانەکانیدا زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەر قەدەری ژنبوونی خۆی هەروەها خودا بە لایەنگری نێر تۆمەتبار دەکا . ئەوەتە لە امرأتان في امرأة و امرأة عند نقطة الصفر زۆربەی کارە ئەدەبیەکانی ئەو کەربەی خۆی لە ژنبوون گوزارشت لێدەکات : " خودێ ڕەمزە بۆ دەسەلاّتی بێ سنووری نێر ." ||" ڕقم لە خودا دەبیتەوە چونکە منی کردۆتە کچ " ڕقبوون لە خودا و ژنبوون گرکانی ڕقی نەوال ناکوژێنێتەوە ، بۆیە هێرشێکی توند دەکاتە کاراکتەری پیاو :" ئێوەی پیاو هەموو تاوانبارن بە باوك و مام خال و مێرد و پارێزەر و ڕۆژنامەوان...." " دەبیت پشیلەیەك نەکوژم ، بەلاّم دەبی پیاوێك بکوژم —نەوال سەعداوی ، ئایدیۆلۆژیای ڕق "

ئەو دیاردەیە لە قورئان تایبەت نییە بە ڕەگەز بەلّکو بە ڕوانینی سێکسی هەردوو ڕەگەز لە یەکتر . خودا لە قورئان داوا لە پێغەمبەرەکەی دەکات کە" داوا لە پیاوانی موسلّمان بکات چاویان لە ئاست ژنی نا-موحرەم دابگرن هەروەها ژنانیش چاوداگرن لە ئاست پیاوی نا-موحرەم ".

هەرچەندە فێمینیستی کورد لە سەدا نۆوەتی بە ناسنامە موسڵمانە کەچی هێندەی باوەڕی بە ئایدیۆلۆژیای ڕقی نەوال سەعداوی بە ڕانبەر بە زاتی خودا هەیە هێندە باوەڕی بە پرانسیپەکانی قورئان نییە .

## چوار شێوە زەواجەکەی جاهیلی لە ترۆپکی بیرمەندیدا

لە زۆربەی کتێبەکانی سیرە –ژیاننامەدا قسە لە سەر چوار جۆرەکەی پەیوەندی سێکسی شەرعی و ناشەرعی کراوە .

عائیشەی دایکمان پێمان دەڵێت کە چوار شێوە بوو :

١. یەکیان بەو شێوەیە بوو ، کەئێستا هەیە

٢. سەرجێیی کردن : پیاوەکەی ژنەکە پێی دەڵێ کە پاش عادە لەگەڵ فلانە پیاو بنوو ، تا وەجاغزادەیەکیان لەو پیاوە هەبێت ،( لە خوارەوەی شەستەکان ئەو دیاردە قێزەونە لە ناو هەندێ تیرەی کورد هەبووە!!)

٣. دە پیاو کەمتر سێکسیان لەگەڵ ژنێك دەکرد ، پاش هەبوونی زگ خۆی بە سەر پیاوێك ساخدەکردەوە!

٤. سۆزانی، ماڵەکەی بەوە دەناسراوەوە کەئالآیەکی سووری هەڵدابوو!

لەم ڕۆژەدا پەیوەندییە ناشەرعیەکان لە سەردەمی جاهیلی زیاترن ، بۆ نموونە ئەم پەیوەندییانە زیاترن لە نێو بەرەی هونەمەند و گۆرانیبێژ و ئەکتەر ...دا هەیە . لە زەواجی هونەری و ناو هونەر و عورفی بە شێوەیەکی بەربلاو هەیە ، باشترین نموونە زەواجی زینە و ئەحمەد عزە کە ئەوەی دوایی ڕەتی

بەرنامەی ( دی ئێن ئێن ) دەکات . لەولاوەش زەواجی چێژ – موتعە و ڕابواردنی نایت کلاب و دیسکۆ و سۆزانیخانە...کەواتە ئافرەت لەو هەموو ماوەیەی نێوان جاهیلی و ئێستا چی بۆ ئافرەت زیادکردووە ؟؟ ئایا موحەمەد قوتب وتەنی ئێمە لە جاهیلیەتی نوێ ناژین؟؟؟

حەمورابی وەك یاسا دارێژەرێك ئافرەتانی کۆمەڵگای بۆ سێ جۆر دابەش کردبوو :

١. ئافرەتی ئازاد ( خانەدان )

٢. ئافرەتی کۆیلە –خزمەتکار

٣. سۆزانی

## کەناڵەکانی ڕوانینی نێرانە

لە سەردەمی هەژموونی ئای تی دا لە نەزەر مالقی فیلم و مەلتی میدیا بە گشتی بەرهەمی ڕوانینی نێرانە-شیلان١٣٣. سەیرم بەوە دێت ئەو ڕوانینە بە جۆرێکی تر تەوزیف دەکرێت لای فێمینیستی کوردی . لە پەنا پەردەی کاردانەوەی پیاوی کوردی عەلمانی لە بەرانبەر گومانی ناموس ، زۆر شێلگیرانە بەرگری لە پرۆسەی ناموس پارێزی دەکەن !

بزاڤی فێمینیستی چ دەڵێت با بڵێت دەربارەی ناموس پارێزی ، چونکە ئەوەی هەتکی ناموس و حەیا دەکات هەڵگری چ شوناسێکە؟؟ ئایا بکەر و بەرکاری شەوە سورەکان کێن؟

لەم نووسینەدا قسە لە سەر ئەم مەسەلەیە ناکەم ، بەڵکو جەختی سەرەکیم لە سەر کەناڵەکانی شکاندنی شکۆی ئافرەتە ، کە بریتین لە فیلمی سێکسی ڕووت و نیمچە ڕووتی و هونەری هەروەها بڵاوکردنەوەی ئایدز .

## کەنیزەك و فلیمی پۆرنۆگرافی و وروژێنەر؟

گـــەر ڕاســـتت دەوێ هەقـــە بیرمەنـــدی ســـیکیولەر –لایسیســـت و فێمێنیستی جیهانی و لۆکەلی لە شەرما ڤێ بیانگرێت ، چونکە بەشێوەیەکی زۆر درندانـە و نـا-دادوەرانـە بـاس لـە پۆشـاکی ئـافرەتی موسـڵمان دەکـەن هەروەها قسە لە سەر هەبوونی ئاماژە بە کەنیزەك لە دەقی قورئان دەکەن . لە بەشی پێشەوە دەرمانخست بە هیچ جۆرێ جاریە و سەبایە لـە قورئانـدا نییە ، بەلاّم لەم دوو جۆرە فیلمە جۆرێك لە کەنیزەکیان تیایە ، کـە هـەموو سنوورێك دەبەزێنێت .

لە فیلمی پۆرنۆگرافی –ڕووت دا تەواو شکۆی ئافرەت بـن پـێ دەکرێـت . لـە پێنـاو ( پـارە ) و ( چـێژ) و (بلاّوکردنـەوەی ئیباحیـەت –بـەرەلاّیی سێکسی) ئافرەتی شەهادەدار و بـێ شـەهادە لـە ژێـر پەرچەمی تەکنـەلۆژیای نوێ و دیموکراسیەتی لیبرالی ، کە فۆکۆیاما بە کۆتـایی مێـژوویی دایـدەنێت ، ئەو ئافرەتە (لە هەموو پۆشاکێك ڕادەمالرێت ) ، ( لە بەردەم کـامێرا سێکسـی لەگەڵ دەکرێت ) ، ( ئەو سێکسکردنە هەندێ جار چەند پیـاوێ لەگـەڵ یـەك ژن دەبێت ) ، لە پاشان ئـەو وێنانـە بـە فیلم و فۆتـۆگراف لـە ئەنتـەرنێت و سی دی ...بە هەموو دنیا بلاّودەکرێتەوە ...توخوا ئەمـە سـەروو –کـەنیزەکی و کۆیلەیی نییە؟؟!

ئەورووپا و فێمینیستی جیهانی ئەو دیـاردە قێزەونـە بـە ئـازادی کەسـی دادەنێن؟؟ ئایا خراپترین شێوەی کەنیزەکی (کارەکەری سێکسی )نێـو تـوراس بە دەیان قەد لەو دیاردە سێکسیە جاهیلیە پەردە پـۆش تـر نییـە؟؟ ئـەو بـێ-پەردەییەی ئەورووپا گەورەترین سوکایەتیە بە خودی ئافرەت ...

ئەو سێکسە بەربادە بە دەگمەن لە سەر ئاستی خێزان و کەس قەبووڵ دەکرێت ، بەڵام پێویستی ئابووری و ئارەزووی سێکسی ، ئیرادەی لەو ئافرەتە ڕاماڵیوە و بۆتە کەرەستەیەکی سێکسی بە دەست بەرهەمهێنەرەوە.

لە لایەکی دی ئافرەت ی کەمدەرامەت لە کارگە ئیستغلالی سێکسی دەکرێت . شیلان وتەنی بۆ خۆ دوورخستنەوە لە مەرازی سێکسی پیاو ، پرچی —قژی وا دەتاشی کە لە کوڕ بچێت یا هیچ حاڵەتێکی سەرنج ڕاکێشانی سێکسی نەبێت .

لە لایەکی دی فیلمی وروژێنەری نیمچە ڕووت خراپترە لە فیلمی تەواو ڕووت ، چونکە ئەم جۆرە فیلمە نەك هەر دێتە زۆربەی ماڵانی موحافیزکار ، بەڵکو بەشداریشی پێدەکرێت لە ( کان ) و (ئۆسکار ) . لەو جۆرە فیلمانە ئافرەت وەك کەرەستەیەکی وروژێنەر مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت .

لە بواری گۆرانیش ، ڕووتەمەنی فاکتەری سەرکەوتنی گۆرانیەکە ، نەك تێکستەکە ! جلەکانی هەیفا وەهبی و ئەلیسا و نانسی ... ڕەمزی ناودارێتیانە! نەك ( دەنگ ) و ( تێکستی گۆرانیەکان) . شیلان ٢٠١٥ ،ل١٣٣ لە مالقی دەگوازێتەوە کە فیلم و مۆلتی میدیا بە گشتی بەرهەمی ڕوانینی نێرانەن" ، چونکە لەو پرۆسەیەدا زومی کامێرا لەسەر ئەو پارچانەی جەستەی ژنە ، کە بە سێکسی ناسراون-هەمان لاپەڕە.

ئایا لەو هەموو پرۆسەیە حەیا و جەستەی ئافرەت هەراج ناکرێت؟؟ ئایا ئەو دیمەنانە لوتکەی جاریەبوونی نییە؟؟

نەتەوەکانی ئەوروپا و دەوروبەری کورد لوتکەی ئەو دیمەنانەن ، بەشێك لە دایەسپۆرای کوردی لە دەرەوە هەندە دژی بەهاکانی ئیسلامن بە

تایبەتی لە نێو کوردی باکوور و ڕۆژهەلأت کچەکانی خۆیان لە سەر پەیڕەوی ئیرانی و تورکی و عیراقی ڕادەهێنن ، لەو ڕۆژانە لە یەکێك کەنالەکانی کوردستان ، باسی گۆرانی بێژێك بەناوی ( باران ) کرا ، کە بە( شۆرت )گۆرانی ( فارسی ) دەگوت ، چونکە کوردی نەدەزانی!!

یەکێك نەزانی ئافرەتی تورك و فارس و عەرەب بە ڕووتەمەنی پێش کەوتوون ، هەتا ئافرەتی کوردیش بەو ڕووتیە پێش بکەوێ ؟؟

## ژێدەری جاریەی سەردەم

لەم کورتە نووسینەدا قسە لە سەر سێ جۆری جاریە و سۆزانی سەردەم دەکەین :

### ١. جاریە و سۆزانی ئایدیۆلۆژیا

ئەم جۆرە ئایدیۆلۆژیایە زیاتر لە فەلسەفە و حوکمڕانی شیوعیەت هەبووە . ئەنجلز بە پاڵپشتی لویس مۆرگان ١٨٦٦-١٩٤٥ لە ئەصل ئەلعائلەدا لە ڕوانگەیەکی مەتریالی قسەی لە سەر خێزان کردووە پێیوابووە کە ململانێ لە خودی خێزانیش هەیە بەوەی پیاو بۆرژوایە ؛ ژن پرۆلیتار و چەوساوە . ئەو فەلسەفەیە بۆ ماوەی ٧٤ ساڵ لە سۆڤیەت کاری لە سەر دەکرا . ئەو حوکمڕانیە باوەڕی وابوو کۆمۆنیستی کۆتایی مێژووە ، ڕۆژێك دێ دەوڵەت بوونی نامێنێ ؛ بەو پێیەش خێزان لە چارەسەری حوکمڕانی شیوعیدا بوونی نامێنێت. لە سۆڤیەت و ئەورووپای شەرقی جۆرە مومارەسەیەکی سێکسی باو بوو ، ئەوال سەعداوی ناوی دەنێت سێکسی ئایدیۆلۆژیا یا سێکسی ئازاد و لەزەت بەخش ، نەك سۆزانی یا لەشفرۆش!

لە دوای هەرەسی حوکمڕانی شیوعیەت لە سۆڤیەت و ئەورووپای شەرقی ، ڕەوشی نالەباری ئافرەت دەرکەوت ، کە هەموو مەلهاکانی تورکیای لە نۆوەدەکان گرتەوە.

ئایا لەو پرۆسەیەدا جەستە و کەسایەتی ئافرەت قوربانی ئایدیۆلۆژیا و لەزەت نەکراوە؟ دوای هەرەسیش لەش و لاری نەبۆتە کەرەسەی تێروانینی نێر لە پێناو پارەدا؟

### ٢. جاریە و سۆزانی لەزەت

لە ئەمریکا و ئەوروپای غەربیدا ئایدیۆلۆژیا غائیبە ، ئەوەی هەیە بەرژەوەندیە . لە زۆربەی دەستوورەکانی ئەوروپا ژن پلەی یەکەم و پیاو دوا پلەی وەرگرتووە ، بەلاَم لە ئەرزی واقیعدا پرۆسەکە بە پێچەوانەیە.

ئافرەت لەو دەستوورانەدا تەواو ئازادی پێدراوە هەتا سێکسی ئازاد ، لە چەندان فیلمی وەك Unlawyalful ئافرەت لە پێناوی لەزەت ئامادەبووە خیانەت لە پرانسیپەکانی هەر چوار- Gospelو مێرد و منداڵ بکات هەروەها لە بەرنامەی Scandalی ئەمریکی دەردەکەوێت کە خیانەتی زەوجی هەتا لە نێوان برادەرە نزیکەکان هەیە . ئەو جۆرە سێکسکاریە لە پێناو لەزەت بووە ، نەك پارە هەروەها لەو جۆرە سێکسەدا دەردەکەوێت پیاوی وەك سەرۆك کۆمار و سەرۆك ولاَت و سەرۆك وەزیران و وەزیر و بەڕێوەبەری بانقی نێودەوڵەتی تێوەگلاَون .
لە هەمووشیاندا جەستەی ئافرەت کەرەسەی تێرکردنی ئارەزووەکانی نێر بووە .
لەو هەموو سێکسەدا کەنیسە دەوری غائیبە و دەوڵەت چاوی لێدەقووچێ بەوەی ئازادی شەخصیە!
لە پاڵ سێکسی لەزەت بەخش ، سێکسێکی مەشاع هەیە کارەکتەرەکانی لە پێناو پارە لەزەت بە نێری کۆمەڵگا دەبەخشن. لەو سێکسەدا جاریەی ناو ئۆفیس و کێڵگە و قەصر غائیبە ، بەڵکو سێکسێك ئامادەگی هەیە کە ئافرەت لە پێناو پارە ، پیشە ، حەزی پیاو لەزەت بە لەشکرەکان دەبەخشێ!
لەو سێکسە ئابووری ئامێزە ئافرەت لە جاریەك خراپتر ئامادەیە هەموو حەزەکانی پیاو تێر بکات !

### ٣. جاریە و سۆزانی سیاسی

ململانێی جوو و عەرەب مێژوویکی کۆنی هەیە . لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل ، لە پێناو سەلامەتی ئیسرائیل جووەکان ئامادەبوون جەستەی ئافرەتی ئیسرائیلی هەراج بکەن . دیب عەلی ٢٠٠٧ زۆر نموونە لە کتێبی ژنی جوولەکە دا تۆمار دەکات ، لەوانە بەوەی زۆر سۆزانی جوو لە کۆشکی عوسمانی بوونە-١٩٥:٢٠٨؛ عەشیقەی جوو لە کۆشی مەلیك فاروق -٢٢٣ :٢٢٨؛ ئافرەتی تەواو ڕووتی ئیسرائیلی لە سینا ٢٤٧:٢٥٠ بۆ کەمەرکێشی گەنجی مصری ؛ گواستنەوەی شەیتانپەرستی بۆ مصر ٢٧٣: ٢٩٠... بۆ سێکسککردن لە شوێنە پیرۆزەکان "

لەو هەموو کۆنسپیرسە سیاسیەدا مەکری ئافرەت و نازی ئافرەت و جەستەی ئافرەت کراوەتە کەمەرکێشی پیاوی مصری و فەلەستینی . ناسیۆنالیستی عەرەبی هەمان گەمەی لە چەندان زنجیرەی وەك ڕأفەت هەجان دوو بارە کردۆتەوە بەوەی کەسێتیو جەستەی ئافرەت بەکاربهێندرێ لە پێناو موئامەرەیەکی سیاسی .

## حەریم سوڵتان لە نێوان توراس و قورئان

وەك لە بەشی دووەمی ئەم كتێبە قسەمان لە سەر ئەوە كرد كە پێش هاتنی ئیسلام جاریەی قەصر و سۆزانی ناو عەوام هەبوو . هەبوونی كەنیزەك لە كۆشك و ماڵان و بازاڕ لە ئاكامی ڕەوشی كۆمەلأیەتی ئابووری دروست بوونە . كەنیزەكی داوێنپاك و دوور لە پەیوەندی نهێنی پاوەنێكی هەژار و دەستكورتی موسڵمان بووە بۆ ئەوەی مارەیی بدا و لە ئەهلی بیخوازێت .

حەریم – سولتان یا ئەو بەشەی پێیدەوترێت كەنیزەكانی حەریم بەرهەمی چین؟ دكتۆر دڵشاد ٢٠١٥ لە چەند سەرچاوەیەك دەیگوازێتەوە كە ئەو دیاردەیە لە پێش ئیسلام و پاش ئیسلام بوونی هەبووە . لە ل٤٣ی ژمارە ٥ی گۆڤاری كۆزان دەنووسێت : " حەریم سوڵتان سیستەمێك بووە ، ئەو سیستەمە لە نێو هیندۆسەكان بە ناوی ( بەردە ) هەبوو هەروەها لە نێو فارسەكانیش هەبووە هەروەها لە نێو چینیەكانیش بە ناوی هۆگۆنگ هەبووە ." لە نێو ئیمپراتۆریەتی ساسانی ٢٢٦-٦٥١ میلادی دیاردەی حەریم سوڵتان جەی دەهات ، ئیمپراتۆر نەبوو چەند حەریمێكی نەبێت ، بۆ نموونە خەسرەوی دووەم زیاتر لە ٣٠٠٠ حەریمی هەبوو ، یەكێك لەوانە شیرین بوو، كە دایكی پوران دۆخت و ئازەردۆخت بوو .

لە پاش هاتنی ئیسلام لە هەردوو دەسەلأتی دەوڵەتی مەدینە و خیلافەتی ڕاشدی شتێك نەبوو بە ناوی حەریم ، ئەوەی هەبوو كەنیزەك بوو . لە پاش نەمانی ئەو دوو حوكمڕانیە ، سێ حوكمڕانی ماڵباتی – پاشایەتی دروست بوون بە ناوی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی .

لە توراسی عەرەبی پێش ئیسلام دیاردەی جاریەی کۆشك هەبوو ، بۆیە لە هەردوو خێلافەتەکەی ئەمەوی و عوسمانی خەلیفەی لادەر دروست بوون ، بۆ نموونە لە کتێبی الزندقە و الزنادقە باسی خەلیفەیەك دەکرێت کە بە بوتڵی عەرەقەوە چۆتە سەر دیواری کابە –کەعبە و تەحدای دەسەڵاتی خوای کردووە ! هەروەها دەربارەی خێلافەتی عەباسی دەگوترێت : کاتێك هۆلاکۆ بەغدای گرت ، خەلیفە خەریکی کۆتربازی بوو ...

هەبوونی ئەو دیاردەیەی دەگمەن لەو دوو دەسەڵاتە کەم وزۆر چ پەیوەندی بە دەقی قورئانەوە وەیە؟؟ پیاوەکانی دەسەڵاتی ئەمەوی ئامادە بن سەری حوسێنی کچەزای پێغەمبەر لێبکەنەوە ، هەبوونی حەریم لایان زۆر ئاساییە هەروەها مأمونی عەباسی ئامادە بێت سەری ئەمینی برای خۆی بپەڕێنێت ، حەریم لە چواردەورەی خۆی کۆناکاتەوە؟؟!

حەریم هەر پێشتر لە نێو تورك هەبووە ، دکتۆر دڵشاد ٢٠١٥ ،ل٤٥ دەڵێت : " عوسمانیەکان لەم دیاردەیە بەدەر نەبوونە ، کە میراتگری سەلجووقە ڕۆمیەکان بوون .." دکتۆرە نیشتمان بەشیر٢٠٠٦ لە ل ٧٤ ی کتێبی کورد و سەلجوقییەکان دا دەنووسێت هۆزی غەزی توركی – سەلجووقی بۆ ژیانیان پشتیان بە تالان و ڕاوڕوتی بەستووە هەروەها لە ل٢٢٣-٢٢٥ هەمان کتێب ژنیان وەك کەرەستەیەکی سیاسی بە ناوی هاوسەرگیری سیاسی بەکاردەهێنا ."

لایەنێکی باشی هەبوونی حەریم و زەواج لەگەڵ کردنیان دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی دوورخستنەوەی خزمی ژن لە سیاسەت و هەروەها گێڕانەوەی پارەیەکی زۆر بۆ خەزێنەی دەوڵەت . دکتۆر دڵشاد لە ل٤٤ ناوی چەند

سولتانێکی عوسمانی دەهێنێت کە زەواجیان لەگەڵ حەریم کردووە نەك ژنی ئازاد وەك سولتان سلێمان قانوونی، سولتان ئیبراهیم ، سولتان عەبدولمەجید."

حەریم سولتان یا جاریەی کۆشك بەشێکە لە تەورات و نەریتی نەتەوەکان هیچ پەیوەندی بە کەنیزەکی قورئانەوە ونیە.

## دوا وێستگە :

### ژێدەری ئەم دیاردەیە لە بریتی پوختەی بابەتەکە

لە تەواوی قورئان دەقێك نادۆزیەوە کە لە مرۆڤایەتی ئافرەتی دابێت ، کەچی تەورات و ئینجیلی جوو و دیان ، چونکە دەستکردن ، دەیان دەقی وەك " تاوانبار ، یاخی ، شەیتان نەیتوانی ئادەم هەڵخەڵەتێنێ ، تا حەوا ئادەم هەڵخەڵەتاند...سەری ژن پیاوە ، ژن سەروەری پیاوە ، چونکە ژن لە پیاو بووە ، نەك پێچەوانە . شەرمە ئافرەت لە کەنیسە قسە بکات ، نوقسانی ئافرەت لە نوقسانی عەقڵی دێت ، ئافرەت لە خێزان پرۆلیتارە چەوساوەیە..."

هەر پۆلێنێك بۆ کەمکردنەوەی ماف و ڕانك و کەسایەتی ئافرەت لە کۆمەڵگا ، قسەی مرۆڤن نەك قسەی خودا .

لە ئیسلامدا سێ سەرچاوە هەن کە بریتین لە قورئان +سیرە + فەرموودە . دوو لە سەرچاوەکان دەستی کاربەدەستان و نوسەر و سوڵتان و خەلیفە و والی دەربار و بێ باری کەم و زۆر گەیشتوتێ ، بۆیە شتێکی دروست کردووە بە ناوی توراس و کەلتوور کە کەڵێن و شەقارێکی لە نێوان دەقی ئیلاهی و خۆی دروست کردووە . لێرەدا لە کۆمەڵگای کوردەواری زاراوەی کۆلکە مەلا و مەلای چڵێس و هەژموونی مەرقەد و کاریگەری دوعای شێخ ...دروست کردووە ، کە تەواو دژ بە تێکست و گوتاری قورئانن.

گومان لەوە دانییە کە ڕەگەکانی ململانێی ئەتنیکی و مەزهەبی ...لە نێو مێژووی کاربەدەستانی ئیسلامی هەیە . ئەو ململانێیە لە نێوان

عارەبی ( کاربەدەست ) و مەوالی ( خزم و خوێش یا کائینی دووره دەسەلاَت و فەرامۆشکراو ) ، ململانێکەی تیر تر کردۆوە و بەرەو بەرەی برجوازی ( تیۆری و ڕواڵەتی ) و ڕەشۆکی ( کرداری ) بردووە ، ئەو ململانێیە لەو ئاستە ڕانەوەستاوە، بەلکو ململانێی ئابووری و چینایەتی هەتا دەسەلاَتی لێکەوتەوە ، بۆ نموونە کورد بەشداری کرد لە زۆر بزاڤی دژە " ستەمی دام و دەزگای خەلیفە جۆر بە جۆرەکانی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی .

ئەو توراسە هەلگری ئەو ململانێیە ، بێئەوەی دەق هەلگری هیچ ئاماژەیەکیش بێ ڕەوایەتی بە ئەو ململانێیە بدات . هەر ئەو ململانێ ناوخۆییە بوو ،کە لە سەر ململانێی قەبەلیەوە خیلافەتی لە ڕاشدی بەرەو ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی برد !

لە دەرەوەی خیلافەش هەولی بێزەوەرکردن هەبوو .دکتۆر مەحموود ئیسماعیل لە ل١٤٠-١٤٣ ی کتێبی اشکالیه المنهج... باس دەکات کە بزاڤێك دروست بوو لە سەر بێزەوەرکردنی مێژووی ئیسلامی لەوانە بزاڤی ڕۆژهەلاَتناسی کە هەلگری چەند بانگاشەیەکی درۆزنانەن لەوانە بالاَبوونی ئەتنیکی و حەزاری هەروەها خولقاندنی بانگاشەیەك ، شارستانی ئیسلامی جگە لە ( گواستنەوە ) و ( لاسایکردنەوەی ) توراسی یۆنانی هیچی تر نییە ".

ئەو بانگاشەیە لە لای متنەوەری عەرەبی و فارسی و کوردی شرۆڤەیەکی پڕ تەزویری دروست کرد . زۆربە لە ژێرکاریگەری مارکسی و خوێندنەوەی مەتریالی دابوون ، بۆیە کەسانی ئارگۆن و جابری و ئەدۆنیس ... بە ناوی خوێندنەوەیەکی دی بۆ قورئان ، توراس ، توراس و قورئانیان

تێکەڵ یەك کرد . ئەو دیتنە ئایدۆلۆژی و مەتریالیەی مارکسیەکان سەدمیەکی خایاند و برینەکانی خیلافەی ئیسلامی قوڵترکردەوە .

پاش هەرەسی حوکمڕانی شیوعیەت لە سۆڤیەت و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی ، ڕۆژئاوای کۆلیانیست و سەرمایەدار بە مەنتقی کۆمەڵگەی مەدەنی و مافی مرۆڤ هاتە مەیدانەوە . زۆربەی ئەو نووسەرانەی پێشتر مارکسی بوون ، ئەو جارە بە عەقڵێکی سەرمایەداری کەوتنە دژایەتی پرانسیپەکانی ئیسلام . دکتۆر مەحموود لە ل١٤٣ دا دەنووسێت پاش هەرەسی سۆڤیەت و هەڵوەشاندنەوەی کوتلەی ئیشتیراکی ، ڕۆژئاوا لە ئیسلام دوژمنێکی باوەکوشتەی دۆزیەوە ، ڕۆژئاوا ئایدیۆلۆژی شۆرشگێری ئیسلام و ئایدیۆلۆژی مرۆدۆستانەی ئیسلامی بە مەترسیەکی گەورە لە سەر ڕۆژئاوا ناساند بە تایبەتی پاش شۆڕشی ئێران " و شۆڕشی ئەفغانی .

لە پرسی کەنیزەك و خولام ١٤ ئایەت هەن ، کە تەنیا ٤ی بۆ موسلمان و ١ی بۆ پێغەمبەر ؛ نۆ ئایەتەکەی تر دوور و نزیك پەیوەندی بە هاوسەری ونییە ، بەڵکو ئاماژەن بۆ خولام و خزمەتکار و" کەنیزەکی نێر "

کەواتە قورئان وەك دەق زەواجی موسلمان لەگەڵ جوو ، مەسیحی ، زەردەشتی لە پرسی کەنیزەك لەو پێنج ئایەتە باسکردووە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە ئیسلامدا زەواجی تەبەقی نییە وەك لە هیندۆسی و ئیزیدی هەیە! هەروەها بە پێچەوانەی ئەو مارکسیەتی کارەکتەری ئافرەت بە چەوساوە و پرۆلیتار دەزانێت ، ئەو هەردوو بکەر ( پیاو و ئافرەت ) بە بەشداری پرۆسەی زەواج دەبینێت . هەر لە پرۆسەی کەنیزەککاری هەر موسلمانێك خەلیفە ، سوڵتان ، والی ، مرۆی ئاسایی دەتوانی زەواج لەگەڵ

کەنیزەك بکات ، چونکە کەنیزەکی وا هەبووە چەندان پیاوی ناودار لە ژێر دەستیان خوێندووە .

لە بارەی کەسانی دی ناو کۆشکی یا مالّی موسلمانی خواپێداو خزمەتکاری پیاو ، منالّ ، کەنەفتە هەبووە ، لە بەردەم ئەوانە بە تایبەتی ئەوانەی بالّق نەبوونە یا لە سێکس چوونەتەوە ، خانمی کۆشك ئازاد بووە سەر کۆت ( ڕووت ) بێت هەروەها هەر لەو کۆشکە بە دەقی قورئان خانمی مالّ کەنیزەك و خزمەتکاری پیاوی هەبووە ، بۆیە ئەم مەسەلەیە هیچ پەیوەندی بە کاری سێکسی شەرعی و نا شەرعی نەبووە . هەمان دیاردە لە کۆمەلّگای کوردی هەبووە وەك سەپان ، کارەکەری مالّی ئاغا ، مالّی شیخ ، پیاوی ئاغا هەروەها دیاردەیەکی تر هەبووە لە دەشتی هەولێر کە شێخ و ئاغا کچی بچووکی مالّە هەژاریان لە کوڕی خۆیان مارە دەکرد ، کە گەورە دەبوون بە زۆری ئەو کچانەیان بە نەختی گران دەدا کەسانی تر ، نەك بیانکەنە هاوسەری کوڕەکانیان ، چونکە پێیان شەرم بوو ئەو کەنیزکانە-کارەکەرانە بکەنە بووکی خۆیان و لەقەبی ئاغازادە ، بەگزادە ، شێخزادە ، مەلازادە بەوانە ڕەوا ببینن!

لە کتێبی الزندقە و الزنادقە باسی هەندێ خەلیفە کراوە تەواو صیفەت فیرعەون بوونە و لە سەر دیواری کەعبە بە سەرخۆشی تەحەدا و تەعدا لە ماف خوایەتی خوا کردووە ، جا گەر جۆری ئەوها لە حوکمڕانی ئەمەوی و عەباسی هەبن ، هەر ئەوانە جاریەیان هەبووە ، بۆیە ناتواندرێ بەرگری لەو کەسانە بکرێ هەر ئەو کەسانە بوون لە بەر خۆشگوزەرانی و ڕابواردنی خۆیان نەیانتوانی بەرگەی لەشکری هۆلاکۆ بکەن و بوونە هۆی کوشتنی بە دەیان هەزار بێ تاوان.

هەبوونی حاڵەتی حەرەمسەرا و جاریە لە کۆشك دەستکردی مرۆڤن یا زادەی تەقلیدی توراسی کۆنی عەرەبی و فارسی و تورکی و کوردین . بوونی هەر کردارێکی سێکسی پێچەوانەی دەقی قورئانن هەروەها لەو پرۆسەیەدا ئافرەتی وەك ڕۆکسلانا و صەفیەی ئیتالی هەن کە دەوری ڕوخاندنی جوزئی دەوڵەتی عوسمانیان پێسپێردراوە ، بەمجۆرە ئەو دوو بوونە ئاژاوەی گەورە لە دەوڵەتی عوسمانی لە تیرۆر و ژەرعکردنی سوڵتان و خەلیفەی لادەر و بکوژ و سەرخۆش .

بەدیلی ئەو حاڵەتە نامۆیەی جاریە و حەرەمسەرا یە لە ئەوروپا بازرگانی کردن بوو بە کەس و جەستەی ئافرەت . جگە لەوەی ئافرەت بۆ کاری لەشفرۆشی بازرگانی پێدەکرا ، جەستەشی ببووە پاوانی پیاو لە پێناو کەنیزەکبوونی ئابووری ئافرەت . فیلمی ڕووت و نیمچە ڕووت تەواوی تەکنەلۆژیای سەردەمی داپۆشیوە ، ئایا لەو گەمەیەدا بەرکاری پرۆسەکە کێیە؟ بکەرەکانی کێن؟ ئایا ئەو پرۆسەیە سەد جار لە جاریەبوون و حەرەمسەرایی خراپتر نییە؟!

مارکسیەکان و فێمینیستەکانی وەك ئەوال سەعداوی لە سەردەمی زێرینی حوکمڕانی شیوعیدا بانگاشەی ئەوە دەکرد کە ئەو سێکسەی دەرەوەی زەواج ، سۆزانی و لەشفرۆشی نییە، بەڵکو سێکسی ئایدیۆلۆژیا و میزاژ بووە ، چونکە بەرانبەر ئەو سێکسکردنە پارە وەرناگرن! ئەو بیرکردنەوەی نەوال و نەوالیەکان گەورەترین قەحپەی ئابووری لە ڕووسیا و ڕۆمانیا و بولگاریا...خوڵقاند کە لە سەردەمی حیزبی عەلمانی تورکی زۆربەی مەلهاکانی تورکیان گەرم کردبوو.

دیاردەیەکی سێکسی تر لە ئیسرائیل و ئەمریکا هەیە ، کە لە زۆر باردا کەنیزەکی ئابووری دروست دەبێت . دیاردەی هۆمۆسێچوەلی لە نێو

سوپای ئـەمریکی و ئیسـرائیلی هەیـە . دیـب عـەلی ٢٠٠٧ لـە کتـێبی المـرأت الیهودیە باس لە چەندان ڕاپۆرت دەکات کە ئافرەتی ئیسـرائیلی لـە سـەربازی سێکسی لەگەڵ دەکرێت هەر ئـەوەش بۆتـە هـۆی فەشـەلی سـوپای ئیسـرائیلی لـە بەرانبـەر سـوپای لوبنانیـدا هـەروەها زۆر ئـافرەتی ئیسـرائیلی کراونەتـە کەرەسـەی سێکسـی چـەندان پلـۆتی سیاسـی لەگـەڵ عــەرەب ، وەزیــری ئیسـرائیلی لـە پێنـاو ئیسـرائیل ئامـادە بـووە چـەندان جـار سێکسـی لەگـەڵ بکرێت!

ئایا ئەو سێکسە ئابووری و چێژ و سیاسیە جۆرێکی دی جاریـەبوون و حەرەمسەرایی نییە؟!

مەسعود عەبـدالخالق ٢٠١٤ لـە ل٢٤ قسـەی کلـۆدیس لـە کۆتـایی سـەدەی نـۆزدە لـە بەڵگەنامـەکانی بـەریتانیا بـە ژمـارە ٧٣٠\١٦١\٢ CO لـە ١٩٣١\٣\١٤ دەگوازێتەوە کـە ئـافرەتی کـورد مـاف لـە ئـافرەتی عـەرەب زیـاتر بـووە، کـورد چارۆگ دەبەستێ لە جیاتی حیجاب هەروەها ئازادانە لەگـەڵ پیـاو ڕەشبـەڵەك دەکا ، سەرکردایەتی هەندێ کۆبوونـەوەی پیـاوان دەکـات هـەروەها لـە غیـابی مێردەکـەی ، بـەخێرهاتنی مێوانـان دەکـات." پیـاوی عـەلمانی و فێمینسـتی سەردەم ئەو وێنەنانەی ئافرەتی کورد دەشـێوێنی و بـە " ئۆڤیانووسـێك لـە تاوان " وەڵامی دەداتەوە !

ئایـا پـارەی مەسـئول کـورد ، کـە لـە قـووتی هـاوڵاتی کـورد پەیـدابووە ئـافرەت لــە هــەر نەتەوەیـەك بێـت بـەرەو جاریــەبوون و ســۆزانیبوون و لەشفرۆشی و تاوان نابات ؟ ئایا ئەو شەوە سورانە لوتکەی جاریەبوون نییە؟

لە کۆتاییدا دەڵێم با جارێکتر لـە سـەردەمی ئێمـەدا تـەویل عومـرێـك دروسـت نـەبێت و دووبـارە بمانگەڕێنێتـەوە فـەزای ساسـانی و ژێـر دەواری ئـەبو جـەهل ؛ نـەزار قـەبانی -وەرگـیراو لـە ل٥٣ی دڵڕەقـی و بێـدەنگی ی

کەنعان مەکییە-لە شیعری ئەبو جەهل فلیت ستریت دەکرێت —بەردەوامی ئەو کەلتورە سەقەتەی جاهیلیەتمان لە کارەکتەری تەویل ئەلعومر بۆ دەگێڕێتەوە ، موحەمەد قوتبیش بەم جاهیلیەتە تەکنۆلۆژیە دەڵێت جاهیلیەتی نوێ :

ئەی تەویلێ ئەلعومر
ئەی ئەو کەسەی بەڕەتڵ ژن دەکڕیت
و بەڕەتڵ خامە دەکڕیت
هیچمان لە تۆ ناوێت
چۆنت پێخۆشە کەنیزەکانت بهێنە..
چۆنت پێخۆشە ملی دەستوپێوەندەکانت بقرتێنە
نەتەوە بە ئاگر و ئاسن گەمارۆ بدە
کەس سامانی تۆی ناوێت
کەس عەبای خەلافەتت لێ نادزێت
شەرابی نەوت تا دوا دلۆپ هەڵقوڕێنە..
بەڵام کولتورمان بۆ بەجێ بهێڵە...

من تەنیا پرسیارێك دەکەم ئەو تەویلێ ئەلعومر و قیاداتی عەرەبییە هەر لە دوای یەکەم جەنگی جیهانییەوە بەڕەتڵ نەبووتەنە مۆتەکەی جیهانی عەرەبی هەروەها وەك کەنعان مەکییە وتەنی بەوپەڕی دلڕەقی و ستەمکاری ئەوە سەدەیەکە بەربوونەتە گیان و شەرەف و نامووسی کوردی -—ئەری ئەوانە تەواو بەرهەمی عەقڵی ئەبو جەهل و ئەبولەهەب ...ئەبو جەهلەکانی ئەمرۆ نیین؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

پاشکۆی - ١

١. فان خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو ما ملكت ايمانكم-٣ النساء

٢. وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۖ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ ۚ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا -النساء (٢٤).

٣. وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۚ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ -النساء (٢٥)

٤. (الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ)-النساء ٣٣

٥. واعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا -النساء (٣٦)

٦. وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ– النحل (٧١)

٧. إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْأَوْ مَا مَلَكَتْأَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ - المؤمنون (٦)

٨. وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ –النور (٣١)

٩. وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَنِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُاللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَالَّذِينَيَبْتَغُونَالْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْأَيْمَانُكُمْفَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَآتُوهُم مِّن مَّالِاللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوافَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَتَحَصُّنًالِّتَبْتَغُواعَرَضَالْحَيَاةِالدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِإِكْرَاهِهِنَّغَفُورٌ رَّحِيمٌ-النور (٣٣)

١٠. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم

مِنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ۚ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ
وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ
كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ -النور(٥٨)

١١. { ٢٨ - ٢٩ } { ضَرَبَ لَكُمْ مَثَلًا مِنْ أَنْفُسِكُمْ هَلْ لَكُمْ مِنْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنْتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنْفُسَكُمْ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ * بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَمَنْ يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ-الروم

١٢. وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ) ﴿الأحزاب:٥٠﴾

١٣. ولا ما ملكت ايمانهن - الاحزاب-٥٥

١٤. او ماملكت ايمانهم - المعارج -٣٠



## ئیلاهی...

دوور لە هەموو ئایدیۆلۆژیایەک
ڕێزت لە منی مرۆڤ ناوە
جا نێر بم یا مێ
لە ناو هەموو کۆت و بەندەکان
ئازادت کردووم
بە چ لایەک لادەم
*********************
(عومەر) یێک لە کوێ بێنم
پڕ بە دەمی هاوار بکا
ئەو مێیە ڕاستی کرد، عومەر هەڵە
هەروا بێژێت:
تاکەی مرۆ دەکەن بە کۆیلە،
لە کاتێکا بە ئازادی لە دایک بوون!

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر